# ناوەرۆک



### تەوەری ژمارە:



### بابەتی گشتی:








# ڕۆژئاوای کوردستان
## دەرفەت و ئاڵەنگارییەکان

گۆڤاری خاڵ بابەتی (**ڕۆژئاوای کوردستان، دەرفەت و ئاڵەنگارییەکان**) دەکاتە ناونیشانی تەوەری ژمارەی داهاتووی گۆڤارەکە، لەو چوارچێوەیەشدا دەخوازێت لێکۆڵینەوە لەم بوارانەدا بکرێت:

- کێشە بنەڕەتیی و مێژووییەکانی خەڵکی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان و سووریا چین؟
- گرفتە ناوخۆییەکانی لایەنە سیاسییەکانی ڕۆژئاوای کوردستان کامانەن و لێکەوتە نەرێنییەکانی چین؟
- ناکۆکییەکانی نێو لایەنە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا، چارەنووسی ئەو پارچەیەی کوردستان بەرەو کوێ دەبات؟
- ئایا هەسەدە توانای پاراستنی ئەو دیفاکتۆیەی هەیە، کە ساڵانێکە دروستیکردووە؟
- ئایا هەسەدە و لایەنە سیاسییەکانی تری ڕۆژئاوا دەتوانن دەرفەتە مێژووییەکانی ئەم قۆناغە بۆ دەستکەوتی سیاسی بقۆزنەوە؟
- خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ڕۆژئاوای کوردستان چین؟
- ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرانبەر بە ڕۆژئاوای کوردستان چییە؟
- ئەو وڵات و لایەنە هەرێمییانە کێن، کە زۆرترین کاریگەرییان لەسەر سووریای دوای ئەسەد هەیە؟
- حکومەتی نوێی سووریا چۆن لە ڕۆژئاوای کوردستان دەڕوانێت؟
- چ جۆرە حکومەتێك و حوکمڕانییەکی دیمەشق بۆ ڕۆژئاوای کوردستان گونجاو و لەبارە؟
- ئایا ڕۆژئاوا دەتوانێت گرفتە هەرێمییەکان تێپەڕێنێت؟
- پشتیوانییەکانی ڕۆژئاوای کوردستان لەلایەن وڵاتانی ڕۆژئاواوە بەتایبەت ئەمریکا تاکتیکین، یاخود ستراتیژ و درێژمەودان؟
- داوا لە نووسەران و شارەزایانی بەڕێزی ئەم بوارە دەکەین، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی، کە ئاماژەیان پێدراوە هەتا ڕێکەوتی (٢٠٢٥/٤/١) بۆ گۆڤارەکەمان بنێرن.




# زیرەکی دەستکرد

## داهاتوو و کاریگەریی لەسەر زانست و ڕۆشنبیریی

لە ژمارەی پێشوودا ئەو ناونیشانەی سەرەوەمان وروژاند و کۆمەڵێک پرسیارمان بۆ شارەزایانی بوارەکە نووسی، مەبەستمان بوو بەوەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە شارەزایان ئێمەش و خوێنەرانیش لەم بابەتە هەستیار و بایەخدارە تێبگەیەنن، هەرچەندە لە کوردستان بە بەراورد بە وڵاتانی پێشکەوتوو پسپۆڕی ئەو بوارەمان زۆر کەمە، جگەلەوە خودی زیرەکی دەستکردیش بە خێرایی لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە، هەربۆیە کەمترین وەڵامی پرسیارەکانمان دەستکەوت، هەرچەندە بەو کەمەش دەروازەی باشمان لەسەر کرایەوە و بەرچاوڕوونی پێویستمان دەستکەوت.

ئەوا لە تەوەری ئەم ژمارەیەدا ئەو زانیاریی و بەرچاوڕوونیانە دەخەینە بەرچاوی خوێنەران، بەوهیوایەی ئەوانیش لە بابەتەکە سوودمەند ببن و بشبێتە جێگەی گفتوگۆی خوێنەران هەتا بزانین ئێمەی کورد لە بواری مەعریفیی و تەکنەلۆجیای زانیاریدا لەکوێی دونیای شارستانی ئەمڕۆداین.

گۆڤاری خاڵ





د. موئمین زەڵمی

# زیرەکی دەستکرد و داهاتووی میدیا:

## چۆن  زیرەکی دەستکرد ڕۆژنامەگەری نوێ دادەڕێژێتەوە



## پێشەکی:

زیرەکی دەستکرد ئەگەر بۆ سیکتەرەکانی تر داهێنان، یان نوێگەری بووبێت ئەوا شۆڕشێک بوو لە بواری ڕۆژنامەگەریدا، چونکە گۆڕانکاری لە چۆنیەتی کۆکردنەوە و بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان و تەواوی ژانرە میدیاییەکاندا دەکات. لەکاتێکدا کە وەگەڕخستنی زیرەکی دەستکرد لە ژوورەکانی هەواڵدا مشتومڕی لەسەر ئیتیکی ڕۆژنامەوانی، ڕەسەنایەتی و ئەگەری بڵاوکردنەوەی زانیاری هەڵەی لێکەوتەوە، بەڵام توانای بەرزکردنەوەی کارایی و داهێنان و بەشداریکردنی خوێنەر و بینەر بەپشتبەستن بە زیرەکی دەستکرد بووەتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر. دەزگا میدیاییە پێشەنگەکانی وەک نیویۆرک تایمز، ئەسۆشێتد پرێس و واشنتۆن پۆست لە ئێستاوە سوود لە زیرەکی دەستکرد وەردەگرن بۆ ڕووماڵ و شیکاریی داتا و نووسینەوە هەتا داڕشتنی ناوەڕۆک و ئاڕاستەکردنی وەرگران. ئێستا زیرەکی دەستکرد ئاسانکاری بۆ ڕۆژنامەنووسان دەکات کە ڕۆتینە دووبارەبووەکان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەنجام بدەن، وەک پوختکردنی ڕووماڵ و بابەتەکان، داڕشتنەوەی سەردێڕەکان و وەرگێڕانی ناوەڕۆک، هەروەها ئاستی توانای ڕۆژنامەوانان بەرزدەکاتەوە بۆئەوەی سەرنجیان لەسەر چیرۆکگێڕانی لێکۆڵینەوەی داهێنەرانە بێت.

ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە ڕۆژنامەگەریدا بەتەواوی نوێ نییە؛ فێربوونی ئامێرە زیرەکەکان و پرۆسێسی زمانەوانیی لە مێژە بۆ چاودێریکردنی سۆشیال میدیا، شیکاری بینەر و خزمەتگوزارییەکانی نووسینەوە بەکاردەهێنرێت، بەڵام زیرەکی دەستکرد نوێنەرایەتی بازدانێکی جیاواز دەکات، تواناکانی وەک داڕشتنی بابەتەکان، دروستکردنی ڤیدیۆ و فراوانکردنی ئەزموونی خوێنەران پێشکەش دەکات. سەرەڕای ئەوەش، ئاڵنگارییەکانی وەک زانیاری هەڵە، قووڵبوونەوەی ناپێویست و نیگەرانییە ئاکاریی و ئیتیکییەکان بەرانبەر بە ڕۆژنامەوانی نوێ هەر بەردەوامن. هەربۆیە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەبێت هاوسەنگی لە نێوان سوودەکانی زیرەکی دەستکرد لەگەڵ پێویستی شەفافیەت و وردبینی و یەکپارچەیی پێداچوونەوەی کۆتایی ڕابگرن و بەرهەمێکی دروست و تەندروست پێشکەش بکەن.





داهاتووی زیرەکی دەستکرد لە بواری ڕۆژنامەگەریدا ئامادەیە بۆ فراوانبوون و چاومان لە داهاتوویەکی جیاوازترە، داهێنانەکانی وەک چاتبۆتی بەهێزی زیرەکی دەستکرد و ئامرازەکانی پشکنینی ئۆتۆماتیکی جێ پێی خۆیان قایم کردووە، بەڵام پیشەسازییە نوێیەکە دەبێت پەیوەندییە ئاڵۆزەکان لەگەڵ کۆمپانیا تەکنەلۆژییەکاندا بەڕێوەببات و چارەسەری پرسە یاساییەکان بکات لە ڕۆڵی خاوەندارێتی کۆزانیی و دڵنیابێت لەوەی کە زیرەکی دەستکرد تەواوکەرە و پاڵپشتە نەک جێگەی ڕۆژنامەنووسان بگرێتەوە، چونکە لەگەڵ بەردەوامبوونی ڕۆژنامەوانان و ئیدیتەرە بەتواناکان لە ژوورەکانی هەواڵدا بۆ تاقیکردنەوە لەسەر زیرەکی دەستکرد، توانای دووبارە داڕشتنەوەی ڕۆژنامەگەری- لەهەمانکاتدا پاراستنی متمانە و کوالێتی- هێشتا جێگایان بە هیچ پڕ نابێتەوە، ئەم بابەتە، وردتر لەسەر گەشەی زیرەکی دەستکرد لە بواری ڕۆژنامەگەریدا دەوەستێت و ئاڵنگارییەکان شیدەکاتەوە و سەرنجە پێویستەکان دەخاتەڕوو.

## زیرەکی دەستکرد و داڕشتنەوەی میدیای نوێ:

لەم ساڵانەی دواییدا، زیرەکی دەستکرد وەک هێزێکی گۆڕانکاری لە هەموو پیشەسازییەکاندا سەریهەڵداوە و ڕۆژنامەگەریش لەوە بێبەری نییە. لەکاتێکدا هەندێک لە بەڕێوەبەرانی میدیا بەوریاییەوە لە زیرەکی دەستکرد نزیک دەبنەوە، لە ترسی کاریگەرییەکانی، بەڵام واقیعەکە ئەوەیە کە زیرەکی دەستکرد لە ژوورە هەواڵییە مۆدێرنەکاندا خەریکە دەبێتە پێویستی. دەزگا گەورەکانی وەک نیویۆرک تایمز، ئەسۆشێتد پرێس و واشنتۆن پۆست لە ئێستاوە زیرەکی دەستکرد لەگەڵ ڕەوتی کارەکانیاندا تێکەڵ دەکەن و هەوڵدەدەن هاوسەنگی داهێنان لەگەڵ ستانداردە ئەخلاقیی و ئیدیتۆرییەکاندا هاوسەنگ بکەن.

ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە ڕۆژنامەگەریدا بەتەواوی نوێ نییە. ساڵانێکە ژوورەکانی هەواڵ ئامێری زیرەک و پرۆگرامیی زمانەوانیی (NLP) بەکاردەهێنن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کارەکانیان. ئامرازەکانی وەک خزمەتگوزارییەکانی نووسینەوە (بۆ نموونە، Otter و Trint) و پلاتفۆرمی شیکاری (بۆ نموونە، CrowdTangle و ChartBeat ) ئەرکەکانی وەک گۆڕینی ناوەڕۆکی قسە بۆ دەق، چاودێریکردنی ڕەوتی سۆشیال میدیا و

شیکردنەوەی بەشداریکردنی بینەریان ڕێکخستووە. ئەم تەکنەلۆژیایانە ڕێگەیان بە ڕۆژنامەنووسان داوە، کە ڕاپۆرتەکانیان فراوان و کاریگەرتر بکەن و کەمتر کات بە ڕۆتین و ئەرکە دووبارەبووەکانەوە بکوژن و تێڕوانینەکان لە کۆمەڵە داتا ئاڵۆزەکانەوە ئاشکرا بکەن.

بۆ نموونە، خزمەتگوزارییەکانی نووسینەوە کە بە زیرەکی دەستکرد کاردەکەن، خەریکە بەهایان لەدەستدەدەن بۆ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە چالاکییەکانی وەک کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانی، چاوپێکەوتن و دانیشتنەکانی دادگا ڕووماڵ دەکەن. ئەم ئامرازانە بە ئۆتۆماتیکیکردنی پرۆسەی نووسینەوە، کات پاشەکەوت دەکەن و هەڵەی ڕۆژنامەوانان کەمدەکەنەوە. بە هەمان شێوە، پلاتفۆرمی شیکاری وەک CrowdTangle یارمەتی ژوورەکانی هەواڵ دەدەن بۆ دەستنیشانکردنی بابەتەکانی ڕۆژ و چاودێریکردنی بەشداریکردنی بینەران لە سۆشیال میدیادا، ئەمەش وا دەکات ڕۆژنامەنووسان ناوەڕۆکەکانیان بەپێی پێویستی و خواستی خوێنەران بگونجێنن.

داهێنانە سەرەتاییەکان، وەک ئەپی هەواڵی Artifact کە بە ئامێری زیرەک کاردەکات، ئاماژەیان بە توانای داهاتووی زیرەکی دەستکرد لە ڕۆژنامەگەریدا دەکرد. ئامانجی ئارتیفاکت ئەوەبوو کە بەکارهێنانی هەواڵەکان سەرنجڕاکێش تر بکات بە کورتکردنەوەی بابەتەکان بەشێوازێک کە بۆ بینەرانی نوێ گونجاوە. ئەم بەرنامە سەرەتاییانە نیشانیاندا کە چۆن ئامێری زیرەک دەتوانێت هەم بەرهەمهێنان و هەم بەکارهێنانی ئاستی هەواڵەکان بەرز بکاتەوە، ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ تەکنەلۆژیای پێشکەوتووتر وەک زیرەکی دەستکرد.

ئێستا زیرەکی دەستکرد نوێنەرایەتی بازدانێکی بەرچاو دەکات لە بواری ڕۆژنامەگەریدا. بەپێچەوانەی ئامێرە زیرەکەکانی پێشوو کە بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ شیکاری داتا و بە ئۆتۆماتیکیکردنی کارەکان بەکاردەهێنران، زیرەکی دەستکرد دەتوانێت ناوەڕۆکی ڕەسەن دروست بکات، لەوانە دەق، دەنگ، ڤیدیۆ و وێنە. لە بواری ڕۆژنامەگەریدا ئەم تەکنەلۆژیایە یارمەتی پەیامنێر و سەرنوسەران دەدات لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی ڕەشنووس و هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆک و گونجاندنی ستۆری بۆ پلاتفۆرمە جیاوازەکان.

بۆ نموونە، زیرەکی دەستکرد دەتوانێت بابەتگەلێکی درێژ کورت بکاتەوە، ناوەڕۆک بۆ بینەران وەربگێڕێت و پۆست یان هەواڵنامە لە سۆشیال میدیا دروستبکات. ئەم توانایانە وا لە ڕۆژنامەنووسان دەکەن کە سەرنجیان لەسەر ئەرکە بەنرخەکانی وەک بنکۆڵکاری و لێکۆڵینەوە و گێڕانەوەکان بێت، بەڵام زیرەکی دەستکرد ئاڵنگارییەکانیش دەخاتە ڕوو. هەمان ئەو ئامرازانەی کە ئاستی بەرهەمهێنان بەرزدەکەنەوە دەتوانرێت بقۆزرێتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری ناڕاست و قووڵبوونەوەی ناپێویست و گێڕانەوەی چەواشەکارانە. ئەمەش هەوڵی ڕۆژنامەنووسان بۆ پاراستنی وردبینی و متمانە ئاڵۆزتر دەکات. دەزگا میدیاییەکان دەبێ ئەم مەترسییانە لەبەرچاوبگرن و لەهەمانکاتدا ڕوونی و لێپرسینەوە لە بەکارهێنانی زیرەکی دەستکرد مسۆگەر بکەن.

ئێمە ئێستا بینەرین کە بەکارهێنانی ڕۆژانەیی زیرەکی دەستکرد لە ژوورەکانی هەواڵدا بە خێرایی فراوان دەبێت. لە دەرەوەی دروستکردنی ناوەڕۆک، زیرەکی دەستکرد بۆ ئەرکەکانی وەک تاگکردنی بابەتەکان، باشکردنی سەردێڕەکان و بەڕێوەبردنی سەرنجەکانی ئۆنلاین بەکاردەهێنرێت. ئامرازەکانی وەک سیستەمی پشکنینی ڕاستی ئۆتۆماتیکی و خزمەتگوزارییەکانی نووسینەوە کە بە زیرەکی دەستکرد بەڕێوەدەبرێن، خەریکە دەبنە پێویست بۆ باشترکردنی کارایی ڕۆژنامەوانان.

بۆ نموونە ڕۆیتەرز زیرەکی دەستکرد بەکاردەهێنێت بۆ دروستکردنی ڤیدیۆ، ئەمەش وا دەکات پەیامنێران لە ڕێگەی ڤیدیۆ ئەرشیفکراوەکانەوە بگەڕێن بۆ سات و ژمارە سەرەکییەکان. بە هەمان شێوە، ئاژانسی ESPNی ئەمریکی زیرەکی دەستکرد بەکاردەهێنێت بۆ دروستکردنی دووبارە کارپێکردنەوەی گرتەی وەرزشی، ڕێگە بە تۆڕەکە دەدات لەکاتی خۆیدا ڕووماڵکردن پێشکەش بکات بەبێ ئەوەی بارگرانییەکی زۆر لەسەر پەیامنێرەکان دروستبکات. ئەم داهێنانانە توانای زیرەکی دەستکرد نیشان دەدەن بۆ ڕێکخستنی ڕەوتی کار و بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان.

هەروەها زیرەکی دەستکرد پشتگیری ڕۆژنامەنووسان دەکات لە ئەرکەکانی دروستکردنی ناوەڕۆک، وەک داڕشتنی مانشێتەکان، کورتکردنەوەی بابەتەکان

و تەنانەت بەرهەمهێنانی وەرگێڕان. بۆ نموونە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ڕایگەیاندووە کە لەکاتێکدا کە ئەوان زیرەکی دەستکرد بەکارناهێنن بۆ نووسینی بابەتێکی تەواو، بەڵام بەکاریدەهێنن بۆ پشکنینی داتاکان بۆ چیرۆکی بنکۆڵکاریی و لێکۆڵینەوە و دروستکردنی وەشانی دەنگی بابەتەکان و پێشکەشکردنی وەرگێڕانی ناوەڕۆک بۆ بینەرانی زمانی جیاواز. ئەم ڕەشنووسانەی کە لەلایەن زیرەکی دەستکرد دروستکراون چاودێری مرۆڤیان لەسەرە و پێش بڵاوکردنەوە بەوردی دەستکاری دەکرێن.

هەروەها واشنتۆن پۆست لە ژووری هەواڵەکانیدا زیرەکی دەستکردی بەکاردەهێنێت بۆ بەرهەمهێنانی ناوەڕۆکی دەنگی کە لەلایەن زیرەکی دەستکردەوە دروستکراوە بۆ هەندێک لە هەواڵنامەکانی. ئەم تایبەتمەندییە دەنگییە ڕێگە بە خوێنەران دەدات ناوەڕۆکی نووسراو بەشێوەی دەنگی بەکاربهێنن، ئەمەش ئاستی دەستڕاگەیشتن و بەشداریکردن بەرز دەکاتەوە. سەرەڕای ئەوەش، بی بی سی لێکۆڵینەوەی کردووە لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی زیرەکی دەستکرد بۆ دروستکردنی جیاکردنەوەی گرتەکان لە بەرنامە ڤیدیۆ و دەنگییەکانی، ئەمەش ڕێگە بە سەرنووسەران دەدات سەرنجیان لەسەر هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکەکە بێت.

لەگەڵ بەردەوامبوونی پەرەسەندنی زیرەکی دەستکرد چاوەڕوان دەکرێت ڕۆڵەکەی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا گەشە بکات. ژوورەکانی هەواڵ تاقیکردنەوە لەسەر ئامرازە بەهێزەکانی زیرەکی دەستکرد دەکەن بۆ فراوانکردنی بەشداریکردنی بینەر، تایبەتمەندکردنی ناوەڕۆک و ئاشکراکردنی شیکاریی داتاکان، بەڵام کۆمپانیاکانی زیرەکی دەستکرد ئێستا لە بیری ئەوەدان کە چۆن چارەسەری نیگەرانییە ئێتیکییەکان بکەن. بە وەرگرتنی بەرپرسیارانەی زیرەکی دەستکرد، دەزگا هەواڵییەکان دەتوانن تواناکانی بۆ داهێنان بەکاربهێنن و لەهەمانکاتدا ئاکار و ئێتیکی ڕۆژنامەگەری بپارێزن.

## زیرەکی دەستکرد لە شاشەکانەوە بۆ ژووری هەواڵەکان:

زیرەکی دەستکرد خەریکە ڕۆژنامەگەری دادەڕێژێتەوە، بژاردەی نوێ بۆ ڕووماڵی هەواڵ و بەرهەمهێنان و بەشداریکردنی بینەر پێشکەش دەکات. دەستپێشخەرییەکانی وەک پرۆژەی (ڕۆژنامەگەری) زیرەکی دەستکرد کە لەلایەن قوتابخانەی ئابووری لەندەنەوە سەرپەرشتی دەکرێت، لێکۆڵینەوە لەوە دەکەن کە چۆن زیرەکی دەستکرد لە ژوورەکانی هەواڵدا لە سەرانسەری جیهاندا یەکدەخرێت. لە ئۆتۆماتیکیکردنی ئەرکە ڕۆتینییەکانەوە هەتا بەرزکردنەوەی ئاستی بنکۆڵکاریی و لێکۆڵینەوە، ئەمەش وا دەکات زیاتر ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد دەربکەوێت و ببێتە هاوڕێیەکی نزیک بۆ ڕۆژنامەنووسان.

لە کۆکردنەوەی زانیارییەکانی هەواڵدا، ئامێرەکانی زیرەکی دەستکرد یارمەتی ڕۆژنامەنووسان دەدەن بۆ دەستنیشانکردنی چیرۆکە ناهاوسەنگەکان و شیکردنەوەی داتا فراوانەکان. دەزگاکانی وەک بلومبێرگ و ڕۆیتەرز مۆدێلی تایبەت بە زیرەکی دەستکردیان پەرەپێداوە بۆ یارمەتیدان لە ڕاپۆرتکردنی هەواڵی ئابووریی و چاودێریکردنی ئاژانسە هەواڵییە جیهانییەکان. بۆ نموونە مۆدێلی بلومبێرگ (LLM) ئەرکەکانی وەک شیکاری خواستەکان و پۆلێنکردنی هەواڵی دارایی پەرەپێدەدات، لەکاتێکدا ئامرازی «سیگناڵ» ی سێمافۆر کە بە زیرەکی دەستکرد کاردەکات زانیارییەکان لە چەندین سەرچاوە لەکاتی ڕاستەقینەدا کۆدەکاتەوە. ئەم داهێنانانە وا لە ڕۆژنامەنووسان دەکەن کە لەگەڵ ڕووداوەکان و پێشهاتەکاندا بن و دوا نەکەون.

هەروەها زیرەکی دەستکرد لە ڕۆژنامەگەری لێکۆڵینەوە و بنکۆڵکاریدا سوودی خۆی دەسەلمێنێت. مۆدێلی نوێ دەتوانێت یارمەتی پەیامنێران بدات کە بڕێکی زۆر لە بەڵگەنامەکان بپشکنن، وەک تۆمارەکانی دارایی هەڵمەتی هەڵبژاردن، یان وردبینی و چاودێری دارایی حکومەت، داتاکان وەگەڕ بخەن بۆ ئەنجامی دروستتر، کە لە هەندێک حاڵەتدا، ئامرازەکانی زیرەکی دەستکرد بەکاردەهێنرێن بۆ کردنەوەی ئەرشیفی گشتی، ڕیزبەندیکردنی بەڵگەنامەکان بەپێی بابەتی پەیوەندیدار و هەڵێنجانی زانیاری گرنگ، کە دەتوانن ببنە هۆی هەواڵی خێرا.

هەروەک ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە بەرهەمهێنانی هەواڵدا بە خێرایی فراوان دەبێت، ئەرکەکانی وەک نووسینەوە، داڕشتنی ناوەڕۆک و ڕاستکردنەوە ڕێکدەخات. ڕۆژنامەنووسان دەتوانن سودوەربگرن لە خزمەتگوزارییەکانی نووسینەوە کە لەلایەن زیرەکی دەستکردەوە بەڕێوەدەبرێن وەک ئۆتەر و ترینت، کە قسە دەگۆڕن بۆ دەقی نووسراو. ئەم ئامرازانە بەتایبەتی یارمەتیدەرن بۆ ژوورەکانی هەواڵ کە ڕووماڵی ڕووداوەکان دەکەن کە بڕێکی زۆر لە ناوەڕۆکی قسەکردنیان تێدایە، وەک کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی یان چاوپێکەوتن.

بۆ نموونە وەک باسکرا، ڕۆیتەرز زیرەکی دەستکردی وەرگرتووە بۆ دروستکردنی هەواڵی خێرا و پوختەی ڤیدیۆیی، ئەمەش وایکردووە پەیامنێران ئاسانتر لە ڕێگەی ڤیدیۆ ئەرشیفکراوەکانەوە بگەڕێن بۆ کات و ژمارە سەرەکییەکان. هەروەها کۆمپانیای زیرەکی دەستکرد پشتگیری ڕۆژنامەنووسان دەکات لە ئەرکەکانی دروستکردنی ناوەڕۆک، وەک داڕشتنی مانشێتەکان، کورتکردنەوەی بابەتەکان و تەنانەت بەرهەمهێنانی وەرگێڕان.

جگە لە بەکارهێنانی لە بەرهەمهێناندا، زیرەکی دەستکرد ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە بەرزکردنەوەی ئاستی بەشداریکردنی وەرگر و بینەران لەگەڵ کەناڵەکاندا. ئامرازەکانی زیرەکی دەستکرد دەتوانن یارمەتیدەر بن لە تایبەتمەندکردنی ئەزموونی بەکارهێنەر لە ڕێگەی بەڕێوەبردنی ڕووپەڕی داینامیکی، بەدواداچوونی هەڵسوکەوتی خوێنەر و پێشنیارکردنی ناوەڕۆکی پەیوەندیدار بە پشتبەستن بە هەڵبژاردەکانی تاکەکەسی. بە تێگەیشتن لە خوو و گەشتەکانی بینەر، زیرەکی دەستکرد دەتوانێت سەرنجی خوێنەران بەرەو ئەو بابەتانە ڕابکێشێت کە ڕەنگە گرنگبن بەلایانەوە، بەم شێوەیەش بەشدارییەکی فراوانتر دەکات و کاتی بەشداریکردن زیاد دەکات.

هەروەها کورتە هەواڵە دروستکراوەکانی زیرەکی دەستکرد بۆ سۆشیاڵ میدیا ڕۆڵی گەورەیان بینیوە لە بەرزکردنەوەی ئاستی ژمارەی خوێنەراندا. لە تاقیکردنەوە سەرەتاییەکاندا، کورتە هەواڵەکانی زیرەکی دەستکرد لەلایەن وەرگران و بەکارهێنەری سۆشیاڵ میدیا لە نەرویج و ڕۆژنامەکانی باشووری ئەفریقا بەکارهێنراون بۆ زیادکردنی ئەو کاتەی خوێنەران بۆ بابەتەکان

تەرخانی دەکەن. بۆ نموونە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست چاتبۆتێکی زیرەکی دەستکردی خستەگەڕ کە لەسەر ئەرشیفەکەیان ڕاهێنرابوو، توانای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی خوێنەرانی هەیە کە پەیوەندییان بە کەشوهەواوە هەیە. ئەم چاتبۆتە لەگەڵ ئەندازیارانی کۆمپانیای ڤێرجینیا پەرەی پێدراوە، پرۆگرامی (RAG) بەکاردەهێنێت بۆ گەیاندنی وەڵامی ورد لەسەر بنەمای بابەتەکانی مێژوو و تەنانەت سەرچاوەکانیش دەهێنێتەوە بۆ پشتڕاستکردنەوە.

ڕۆژنامەی فاینانشیاڵ تایمز چاتبۆتێکی هاوشێوەی بە زیرەکی دەستکرد جێگیرکردووە، کە یارمەتی بەشداربووان دەدات لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئێستا و زانیاری فراوانتر. هەرچەندە هێشتا لە تاقیکردنەوەی سەرەتاییدایە، بەڵام ئاماژەکان هەندێک ناتەباییان لە وەڵامەکانی زیرەکی دەستکرددا خستۆتە ڕوو، بەتایبەتی کاتێک پرسیاریان لێدەکرێت دەربارەی بابەتگەلێکی ئاڵۆز یان داهێنەرانە. هەروەها توێژینەوەیەکی ئەم دواییەی دەزگای ڕۆژنامەوانی (JRA) لەسەر زیرەکی دەستکرد ئاماژەی بەوە کردووە کە زیرەکی دەستکرد کێشەیەکی زۆری هەیە لەگەڵ کورتکردنەوەی بابەتە درێژەکان، بەتایبەتی ئەوانەی ناوەڕۆکێکی ئاڵۆزتر یان بیرۆکەی قووڵتریان هەیە

## زیرەکی دەستکرد لە نێوان متمانەی خوێنەران و قەپاڵی کۆمپانیاکانی ڕێکلامدا:

زیرەکی دەستکرد مشتومڕێکی بەرچاوی لە میدیای هەواڵییدا وروژاندووە، بە پلەی یەکەم بەهۆی پرسەکانی وردبینی، شەفافیەت، لایەنگیریی و تایبەتمەندی. ستۆرییە دروستکراوەکانی زیرەکی دەستکرد نیگەرانییەکانیان لەبارەی کۆپی پەیست، نادروستی ڕاستییەکان و ئەگەری زانیاری هەڵە وروژاندووە. لەگەڵ زیادبوونی پشتبەستن بە پوختەکانی زیرەکی دەستکرد لەلایەن بزوێنەری گەڕانەوە، مەترسی ئەوە هەیە کە ئەم ئامرازانە بینەران بەلاڕێدا ببەن، بەتایبەت ئەگەر داتاکانی ڕاهێنان لایەنگری یان کەموکوڕییان هەبێت. سەرەڕای توانا سەرنجڕاکێشەکانی زیرەکی دەستکرد، بەڵام تێگەیشتنێکی یەکسانی لە جیهاندا نییە و هەوڵ دەدات بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان پێش هەڵسەنگاندنەکان بکەوێت، ئەمەش ناوبەناو هەڵەی لێدەکەوێتەوە. سەرەڕای

ئەوەش، سیستەمەکانی زیرەکی دەستکرد دەتوانن لایەنگرییەکان گەورە بکەن و زانیاری درۆ یان چەواشەکارانە دروست بکەن، وەک لە حاڵەتەکاندا دەبینرێت کە زانستی ڕەگەزی پووچەڵکراوە لە ڕێگەی ئامرازەکانی زیرەکی دەستکردەوە سەریهەڵداوە. بۆ نموونە ئێستا زۆربەی ئاژانسەکان کاتێک هەواڵی هەندێ ڕێکخراوی چەکداری وەک پارتی کرێکارانی کوردستان یان ڕێکخراوەکانی سوریا و ئەفغانستان دەگوازنەوە بە خێرایی ناوزەدیان دەکات بە گرووپی «تیرۆریستی»، ئەمەش لایەنگیرییەکی تەواوی زیرەکی دەستکرد دەردەخات، هەربۆیە پێداچوونەوە و ئیدیت زۆر گرنگە.

سەرەڕای ئەم ئاڵنگارییانە، خواست لەسەر ڕوونی لە ناوەڕۆکی دروستکراوی زیرەکی دەستکرددا لە زیادبووندایە، خوێنەر و وەرگران دەیانەوێت بزانن کەی زیرەکی دەستکرد لە بەرهەمهێنانی هەواڵدا بەکارهێنراوە. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی وەک نیویۆرک تایمز دەستیانکردووە بە چارەسەرکردنی ئەم نیگەرانیانە بە دابینکردنی شەفافیەت لەسەر ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە کارەکانیاندا، دڵنیابوون لەوەی کە چاودێری مرۆڤەکان بە درێژایی پرۆسەکە دەپارێزرێت. سەرەڕای ئەوەش، ناوەڕۆکی دروستکراوی زیرەکی دەستکرد هێشتا ڕووبەڕووی گومان دەبێتەوە و لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان پێشنیازی ئەوە دەکەن کە بینەران کەمتر متمانەیان بە هەواڵە دارێژراوەکانی زیرەکی دەستکرد هەیە.

بەرزبوونەوەی ئاستی خواست و بەکارهێنانی زیرەکی دەستکرد پەیوەندییە گرژەکانی نێوان کۆمپانیا تەکنەلۆژییەکان و ڕێکخراوە هەواڵییەکانی ئاڵۆزتر کردووە. لەکاتێکدا پلاتفۆرمە تەکنەلۆژییەکانی وەک گووگڵ و ئەوانی دیکە ڕووبەڕووی ڕەخنە بوونەتەوە بەهۆی قۆرخکردنی داهاتی ڕێکلامەکان و بەکارهێنانی ناوەڕۆکی هەواڵ بەبێ قەرەبووکردنەوەی دادپەروەرانە، بەمەش سەرهەڵدانی زیرەکی دەستکرد ئاڵۆزی دیکەی خستووەتەوە. و دەزگاکانی هەواڵ نیگەرانن لەوەی کە کورتەی هەواڵیی زیرەکی دەستکرد لە بزووێنەری گەڕاندا وەک (تاگ) دەبێتە هۆی ئەوەی پلاتفۆرمە گەورەکان قازانج لە ناوەڕۆکەکانیان بکەن بەبێ ئەوەی پارەی بۆ بدەن. جگەلەوەش زۆرجار ئاژانسە هەواڵییەکان پشت بە کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژیا دەبەستن بۆ پەرەپێدانی ئامرازەکانی زیرەکی

دەستکرد، ئەمەش ڕەنگە پشتبەستنیان بەم پلاتفۆرمانە خراپتر بکات.
لەوانەشە دەزگاکانی هەواڵ لە ململانێی داهاتوودا کاریگەری زیاتریان هەبێت، چونکە سیستەمەکانی زیرەکی دەستکرد پێویستیان بە زانیاری کوالێتی بەرز و کاتی ڕاستەقینە هەیە بۆ باشترکردنی وردبینییەکانیان. ناوەڕۆکی هەواڵ کە ئەم داتایانە دابین دەکات، بۆ ڕاهێنانی مۆدێلەکانی زیرەکی دەستکرد زۆر گرنگە و نەبوونی داتای نوێ دەتوانێت ببێتە هۆی تێکچوونی ئەم مۆدێلانە. ئەمەش دەرفەتێکی جیاواز بۆ ئاژانسەکانی میدیا دروست دەکات بۆ دانوستان لەسەر مەرجەکان لەگەڵ کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆژیا و لەوانەیە ببێتە هۆی هاوکاری زیاتر یان ڕێککاری یاسایی لەسەر خاوەندارێتی فیکری.
لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زیرەکی دەستکرد، گفتوگۆکان لە دەوری خاوەندارێتی فیکریی و قەرەبووکردنەوە چڕتر بوونەتەوە. هەندێک لە ڕێکخراوە میدیاییەکان سکاڵا لەسەر کۆمپانیاکانی زیرەکی دەستکرد تۆمار دەکەن بەهۆی پێشێلکردنی مافی کۆپی پەیست و بڵاوکردنەوە، هەندێکی تریش داوای مۆڵەت دەکەن. هەربۆیە پێویستە چوارچێوەیەکی یاسایی نوێکراوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئاڵنگارییانە بێتە ئاراوە، چونکە کورتە هەواڵ و سەرقەڵەمەکانی زیرەکی دەستکرد هەندێکجار ڕێساکانی ئێستای مافی چاپکردنیان تێپەڕاندووە، بەتایبەتی سەبارەت بە ناوەڕۆکی پشت ڕووپەرەکانی سۆشیاڵ میدیا. هەربۆیە چاوەڕوان دەکرێت لە داهاتوودا هاوکاریی و هەماهەنگی زیاتر لە نێوان زیرەکی دەستکرد و میدیای هەواڵییدا بێتە ئاراوە، ئەگەر کۆمپانیا ڕێکلامییەکان ڕیسەکەیان لێ نەکەنەوە بە خوری.

## کۆتایی:

زیرەکی دەستکرد بەشێوەیەکی بەرچاو خەریکە دۆخی ڕۆژنامەگەری دادەرێژێتەوە و دەرفەتی گۆڕانکاری پێشکەش دەکات بۆ بەرزکردنەوەی ئاست و کوالێتی هەواڵ و بەرهەمهێنان و بەشداریکردنی بینەر. لە داڕشتنی هەواڵ، گواستنەوە، گۆڕینی فۆڕمی هەواڵ لە نووسراوەوە بۆ دەنگیی و ڤیدیۆیی، فراوانکردنی ڕێژەی بینەران، پێشکەشکردنی پوختەی هەواڵیی، کردنەوەی قوفڵی ئەرشیفەکان، هێنانەوەی باکگراوندی هەواڵیی، پێشبینی کەشوهەوا، هەروەها فۆڕمات و داڕشتنی هەواڵ و ستۆرییەکان و ژوورەکانی هەواڵ لە سەرانسەری جیهاندا، لەوانەش پێشەنگەکانی ڕۆژنامەگەری وەک نیویۆرک تایمز، ئەسۆشێتد پرێس و واشنتۆن پۆست، سوود لە زیرەکی دەستکرد وەرگرن بۆ ڕێکخستنی ڕەوتی کار، باشترکردنی کارایی و گەیاندنی ئەزموونی تایبەتمەندیی کەسی بۆ بینەرەکانیان، بەڵام لەگەڵ زیادبوونی ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە ڕۆژنامەگەریدا، ئاڵنگاری بەرچاویش دەردەکەون کە دەبێت چارەسەر بکرێن بۆ دڵنیابوون لە پابەندی ئیتیکی ڕۆژنامەوانیی و بەرپرسیارییەتی ئاکاری میدیایی. بۆ داهاتووش، ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە بواری ڕۆژنامەگەریدا پڕە لە بەڵێن، پڕە لە کارلێکی فراوانتر و بەکارهێنانی زیاتر. هەربۆیە ڕۆژنامەگەری دەتوانێت زیاتر خۆی بگونجێنێت، بۆئەوەی داواکارییەکانی سەردەمی دیجیتاڵی دەستەبەر بکات، لەهەمانکاتدا ئەرکی سەرەکی خۆی بپارێزێت: هەواڵ، ئاڕاستە و هوشیاری ڕای گشتی.

لەکۆتاییدا گرنگە ئەوە بخرێتەوە ڕوو، کە کلیلی سەرکەوتن بۆ ڕۆژنامەگەری لەم دۆخەدا، ئاڕاستەکردنی ڕۆژنامەنوسانە بۆ پێداگرییان لەسەر پابەندی بە ئیتیکی ڕۆژنامەوانیی و بەرپرسیارێتی پیشەیی، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە تەکنەلۆژیا وەک هاوڕێیەک دەتوانێت خزمەت بکات نەک وەک جێگرەوەیەک لە بەدواداچوونی ڕاستییەکان ڕۆڵ بگێڕێت.

## سەرچاوەکان


- بلومبێرگ. (٢٠٢٣، ٣٠ی ئازار). ناساندنی BloombergGPT ، مۆدێلی زمانی گەورەی ٥٠ ملیار پارامێتری بلومبێرگ، کە بە مەبەست لە سفرەوە بۆ دارایی دروستکراوە . لە https://www.bloomberg.com وەرگیراوە.
- پەیمانگای ڕۆیتەرز. (٢٠٢٣، ١٩ی ئەیلول). ئای و ڕۆژنامەگەری: چی لە دوای ئەوە دێت؟ لە https://reutersinstitute.politics.ox.ac.uk وەرگیراوە.
- تاقیگەی نیمان. (٢٠٢٣، ١٣ی تەمموز). بەشی کۆمێنتێکی باشترت دەوێت؟ گرووپی میدیایی گراهام پێیوایە زیرەکی دەستکرد دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لەوەدا . لە https://www.niemanlab.org وەرگیراوە.
- تەککرانچ. (٢٠٢٤، ٢٦ی ئازار). ڕەنگە ئەپی هەواڵی Artifact ی هاودامەزرێنەرانی ئینستاگرام کە بە زیرەکی دەستکرد کاردەکات، لە دوای هەموو شتێکەوە نەکوژێتەوە. لە https://www.techcrunch.com وەرگیراوە.
- ڕۆژنامەی گاردیانی بەریتانی. (٢٠٢١، ١٣ی ئاب). لە فلۆرانسەوە بۆ ئامێرەکان: پەرەسەندنی ڕۆژنامەگەری داتا – لە وێنەکاندا. لە https://www.theguardian.com وەرگیراوە.
- ڕۆیتەرز. (٢٠١٧، ١٥ی ئایار). ڕۆیتەرز نیوز ترەیسەر. لە https://www.reuters.com وەرگیراوە.
- سێمافۆر. (٢٠٢٤، ٥ی شوبات). ناساندنی سیگناڵەکانی سێمافۆر. لە https://www.semafor.com وەرگیراوە.
- قوتابخانەی ئابووریی و زانستی سیاسی لەندەن. (ند). گەڕان بەدوای یەکتربڕینی زیرەکی دەستکرد و ڕۆژنامەگەری. لە https://www.lse.ac.uk وەرگیراوە.
- کوارتز. (٢٠٢٠، ١٩ی ژانویە). چۆن کوارتز زیرەکی دەستکردی بەکارهێنا بۆ ڕیزکردنی دزەکردنی لواندا. لە https://www.qz.com وەرگیراوە.
- ناوەند. (٢٠١٩، ١١ی تشرینی یەکەم). چۆن وۆڵ ستریت جۆرناڵ فێربوونی

قووڵ بەکاردەهێنێت بۆ ئاگادارکردنەوەی ستراتیژی ناوەڕۆک. لە https://medium.com وەرگیراوە.

ـ ناوەند. (٢٠٢١، ٢٦ی ئازار). مانەوە لەسەر بابەت — دروستکردنی مۆدێلێکی بابەتێکی ئۆتۆماتیکی بۆ ڕووماڵکردنی هەواڵی WSJ . لە https://medium.com وەرگیراوە.

ـ ناوەند. (٢٠٢١، ٢٩ی ئازار). پێشبینیکردنی بابەتەکانی FT trending. لە https://medium.com وەرگیراوە.

ـ نیمان لاب. (٢٠١٧، کانوونی دووەم). سەرهەڵدانی ڕۆڵی پرد لە ڕێکخراوە هەواڵییەکاندا. لە https://www.niemanlab.org وەرگیراوە

ـ نیمان لاب. (٢٠٢٤، ٢٨ی ئازار). یەکەم سەرنووسەری ستراتیژی زیرەکی دەستکرد لە واشنتۆن پۆست لە ژووری هەواڵدا باس لە LLM دەکات. لە https://www.niemanlab.org وەرگیراوە.

ـ ئەسۆشێتد پرێس. (ند). زیرەکی دەستکرد لە ئەسۆشێتد پرێس. لە https://www.ap.org وەرگیراوە.








**سەردەشت عەزیز**

پرۆگرامەر و بەڕێوبەری کۆمپانیای «سمارت هاندە»

بۆ تەکنەلۆژیای زانیاری

# زیرەکی دەستکرد

## چییە و چۆن کار دەکات؟

زیرەکی دەستکرد لەوڵاتە پێشکەتووەکان زۆر بەخێرایی گەشەدەکات و هێندەی تر لە کۆنترۆڵکردنی جیهاندا بەهێزی کردوون، ئەم زانستە سەرەڕای ئەوەی دەسکەوتە، بەڵام مەترسیشی زۆرە بەتایبەت بۆ وڵاتە دواکەوتووەکان، کۆمپانیا زەبەلاحەکان زۆر بەچڕی کار لەسەر ئەم زانستە دەکەن و ملیارەها دۆلار خەرجکراوە بۆی. هەوڵئەدەم بەپێی توانا زنجیرە بابەتێک بە زمانێکی سادە کە هەموو کەس تێی بگات لە سەرجەم لایەنەکانی ئەم زانستە بنووسم بۆئەوەی هیچ نەبێت تێبگەین ئەم زانستە چیە و چۆن کار دەکات و چۆن دەتوانین سودی لێوەربگرین.

زیرەکی دەستکرد بەشێکی زانستی کۆمپیوتەرە، کە بریتییە لە سیستەم یاخود بەرنامەیەکی کۆمپیوتەری کە هەوڵدەدات لاسایی مرۆڤ بکاتەوە و ئەو کارانە بکات کە پێویستی بە زیرەکی مرۆڤە. زیرەکی دەستکردن لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە لە فێربوون، بیرکردنەوە و جیاوازیکردن لە نێوان شتەکاندا، هەروەها چارەسەری کێشەکان. زیرەکی دەستکرد توانای هەیە لە زمانی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی مانادار و سودبەخش تێبگات.

دوای ئەوەی زیرەکی دەستکرد لە مرۆڤەکانەوە فێربوو پاشان ئەم زیرەکییە دەگوازرێتەوە بۆ ئامێرەکانی دیکە وەک چەکی سەربازیی و ڕۆبۆت و ئامێری پزیشکیی و دەیان جۆری ئامێری تر. ئەم پرۆسەی فێربوونی زیرەکی دەستکردە لە مرۆڤەوە دەگاتە ئاستێک کە بتوانێت وەک کەسێکی شارەزا توانای شیکاریی و بڕیاردانی هەبێت، بۆ نموونە پشکنینی پزیشکیی و دەستنیشانکردنی چارەسەر و هۆکار.

## نموونەی زیرەکی دەستکرد

١- چات جی پی تی: بەرنامەیەکە لە هەر بوارێکدا پرسیاری لێ دەکەیت بەجۆرێک وەڵامدەداتەوە وەک پسپۆڕێکی ئەو بوارە بێت. یان، مۆبایل، بۆ نموونە کاتێک تەنها بەدەموچاوی خۆت دەکرێتەوە و دەتناسێتەوە.

٢- ئۆتۆمۆبێلی بێ شۆفێر.

٣- ڕۆبۆت.

٤- بەشێک لە کارەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، بۆ نموونە دەزانێت تۆ ئازەزووی چ جۆرە ڤیدیۆ یان پۆستێک دەکەیت.

٥- نموونەکانی زیرەکی دەستکردن زۆر زۆرن، لە ئێستادا زۆربەی بوارەکان زیرەکی دەستکردنی تێچووە و لە داهاتوویەکی نزیکیشدا شتی سەیرتر لەم زانستە دەبینین.

## جۆرەکانی زیرەکی دەستکرد

زیرەکی دەستکرد بەگشتی دوو جۆرە:

١- سنوردار: ئەم جۆرەیان بۆ کارێکی تایبەت دروستکراوە و لەو بوارەدا شارەزا کراوە، بۆ نموونە ئۆتۆمۆبێلی بێ شۆفێر، ئامێری ناسینەوەی دەمووچاو

٢- بێ سنور یان گشتی: ئەم جۆرەیان هەتا ئێستا گریمانەییە و زانست پێی نەگەیشتووە، کە بریتییە لەوەی زیرەکی دەستکردێک دروست بکرێت کە لە زۆر بواری جیاوازدا شارەزابێت و بەتەواوی نزیک بێتەوە لە مرۆڤ.

## چۆن زیرەکی دەستکرد فێردەکرێت؟

مرۆڤ لە ڕێگەی تێکەڵەیەک لە پرۆسەی مەعریفیی و کۆمەڵایەتی و ژینگەییەوە فێردەبێت، بەڵام زیرەکی دەستکرد لە ڕێگەی ڕاهێنان و پێدانی زانیاییەوە فێردەبێت.

بۆئەوەی زیرەکی دەستکرد دروستبکرێت پێویستە بڕێکی زۆر زانیاری کۆبکرێتەوە و ڕێکبخرێن و پاشان پێی بدرێت بۆئەوەی بتوانێت لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانە پێشبینی بکات و بڕیاربدات. فێرکردنی زیرەکی دەستکرد هاوشێوەی پرۆسەی فێربوونی منداڵە، منداڵ لە ڕێگەی فێرکردن و سەرنجدان و ئەزموونەوە فێردەبێت، زیرەکی دەستکردیش لە ڕێگەی پێدانی زانیارییەوە فێردەبێت. بۆ نمونە کاتێک منداڵ پشیلە دەبینێت، پشیلەی گەورە و بچووک بە ڕەنگ و شێوازی جیاواز دەبینێت و لەوێوە وردە وردە ئەم منداڵە تێدەگات لە خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو پشیلانەی بینیویەتی و دەیناسێتەوە. فێرکردنی زیرەکی دەستکردیش بەهەمان شێوازە کاتێک لەناو ملیۆنان وێنەی پشیلەدا خاڵە هاوبەشەکانیان وەردەگرێت و دواتر دەتوانێت بەو خاڵانە پشیلە لە وێنەدا بناسێتەوە.

### سەرەتا بۆ باشتر تێگەیشتن لەم بابەتە گرنگە بزانین ئەلگۆریزم چیە؟

ئەلگۆریزم کۆمەڵە ڕێنمایی و زانیارییەکە، کە بە کۆمپیوتەر دەڵێت چۆن کێشەیەک چارەسەر بکات یان کردارێک ئەنجامبدات. بۆ نموونە چۆن کەسێک هەنگاو بە هەنگاو ڕێنماییت دەکات بۆ فێربوونی شۆفێری. ئەلگۆریزم هەنگاو بە هەنگاو ڕێنمایی کۆمپیوتەر دەکات بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو، بۆ نموونە کاتێک لەسەر گۆگڵ ماپ دەتەوێت بچیت بۆ شوێنێک، ئەلگۆریزمی ئەو نەخشەیە هەوڵدەدات کورتترین ڕێگا لەسەر نەخشەکە بدۆزێتەوە بۆ ئەو شوێنە.

## قۆناغەکانی فێرکردنی زیرەکی دەستکرد:

زیرەکی دەستکرد هەروەک هەموو دروستکراوەکانی دیکەی دەستی مرۆڤ سەرەتا دەبێت دروست بکرێت، پاشان بەکاربهێنرێت.

**یەکەم: کۆکردنەوەی زانیاری**

زیرەکی دەستکرد پێویستی بەبڕێکی زۆری زانیاری هەیە بۆئەوەی فێربکرێت، کە دەکرێت ئەم زانیارییانە لە ڕێگەی نووسین و وێنە و ڤیدیۆ و دەنگەوە کۆبکرێنەوە و پێی بدرێت، هەتا زانیارییەکان زۆرتربن ئەو زیرەکی دەستکردە بەهێزتر دەبێت. ئەم زانیارییانە سەرەتا وەک ماددەی خام مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

**دووەم: ئامادەکردنی زانیارییەکان**

دوای ئەوەی زانیارییەکان کۆکرانەوە، جارێکی تر وردبینی دەکرێن و زانیارییە ناپێویست و دووبارەکان لادەبرێن و پاشان ڕێکدەخرێنەوە و دەخرێنە سەر شێوازی تایبەت بۆئەوەی بدرێت بەزیرەکی دەستکرد، بۆ نموونە بەو شێوازەی چۆن تۆ سەوزەیەک پێش خواردن پاک دەکەیت و ئامادەی دەکەیت.

**سێیەم: شێوازەکانی فێرکردنی زیرەکی دەستکرد**

زانیارییەکان ئامادەن و کاتی ئەوەیە زیرەکی دەستکرد فێربکرێت، ئەم فێرکردنە بە چەند شێوازێکە وەک:

١- فێرکردن لەژێر چاودێریدا: لەم جۆرەدا ناو بۆ زانیارییەکان دادەنرێت بۆئەوەی زیرەکی دەستکرد بیناسێتەوە بۆ نموونە لە وێنەی پشیلە دەنووسرێت پشیلە، ئەمە بۆ سەرجەم زانیارییەکانی دیکەش بەهەمانشێوەن، ئەم پرۆسەیە وەک ئەوە سەیربکە تۆ لەماڵەکەی خۆت هەموو کەلوپەلەکان لەزگەیەکی لێ بدەیت و ناوەکەی لەسەر بنووسیت بۆ نموونە (تەلەفیزیۆن و سەلاجە ... هتد).

٢- فێرکردنی بێ چاودێری: لەمجۆرەدا زانیارییەکان وەک جۆری یەکەم ناوی بۆ دانانرێت، بەڵکو دەبێت زیرەکی دەستکرد خۆی بتوانێت شیکاری بۆ بکات و جیایان بکاتەوە، ئەم جۆرەیان لە سۆشیالمیدیادا زۆر بەکاردەهێنرێت و کۆمپانیاکان بۆ زانینی چالاکی و هەڵسوکەتی بەکارهێنەران سود لەم جۆرە وەردەگرن. بۆ نموونە کۆمپانیایەک ڕێکلامی کردووە بۆ فرۆشتنی"بەرهەم"ێک بۆ بەکارهێنەرانی فەیسبووک لە هەردوو پارێزگای هەولێر و سلێمانی، ئەم جۆرە

هەڵدەستێت بە جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی کە لە هەولێر و سلێمانین و پێشوتر چالاکییان هەبووە لەسەر ئەو بابەتانەی باسی ئەو "بەرهەم"ەی تێدا بووە.

٣- فێرکردن لە ڕێگەی بەهێزکردنەوە: ئەمجۆرە بەکاردەهێنرێت بۆ فێرکردنی زیرەکی دەستکرد، کە خۆی بەپێی ئەو ژینگەی تێیدایە بڕیار بدات بەبێ ئەوەی مرۆڤ دەستێوەردان بکات و هیچ ڕێنماییەکی پێبدات، ئەم جۆرەیان لە ئۆتۆمۆبێلی بێ شۆفێر و ڕۆبۆت و یارییە ئەلیکترۆنییەکان بەکاردەهێنرێت. جیاوازی ئەم جۆرەیان لە جۆری دووەمی فێربوون ئەوەیە کە ئەم جۆرە بەهۆی بیردۆزی (تاقیکردنەوە - هەڵە)وە فێردەبێت نەک لە ڕێگەی پێدانی زانیاییەوە. هەروەک چۆن مرۆڤ سەرەتا ئەو شتانەی نایزانێت تاقیدەکاتەوە و هەڵە دەکات، بەڵام وردە وردە فێردەبێت و هەڵەکانی نامێنێت.

**چوارەم: هەڵبژاردنی ئەلگۆریزم**

هەڵبژاردنی ئەلگۆریزمی گونجاو یەکێکی دیکەیە لە هەنگاوە گرنگەکانی فێرکردنی زیرەکی دەستکرد، چۆن مرۆڤ بە چەند شێوازێکی جیاواز کێشەکان چارەسەر دەکات یان فێردەبێت، زیرەکی دەستکردیش چەندین جۆری جیاواز لە چارەسەری کێشە و فێربونی هەیە. لەم قۆناغەدا زانیاریی و ئەرکە جیاوازەکان دابەش دەکرێت بەسەر جۆرە جیاوازەکانی فێربوون و چارەسەری کێشەدا، بۆ نموونە ئەلگۆریزمی ناسینەوەی وێنە جیاوازە لە ئەلگۆریزمی پێشبینیکردنی ئەنجامی یاری تۆپی پێ، هەربۆیە لەم قۆناغەدا ئەلگۆریزمی گونجاو بۆ کێشەکە دیاری دەکرێت هەروەک چۆن کەسێک نەخۆش بێت بەپێی جۆری نەخۆشییەکەی دکتۆری بۆ دیاری دەکرێت.

**پێنجەم: ڕاهێنان**

دوای ئەوەی زانیارییەکان ئامادەکران بۆ بەکارهێنان، ئەم زانیارییانە دەدرێن بە ئەلگۆریزمەکان و ئەوانیش زانیارییەکان شیکار دەکەن ڕێکیدەخەن. ئەم قۆناغە دەبێتە قۆناغی پێدانی پرسیارەکان لەگەڵ وەڵامەکەی بەزیرەکی دەستکرد و زیرەکی دەستکردیش لە ئەنجامی پێدانی ئەو زانیارییانەوە و لەڕێگەی دزۆینەوەی پەیوەندی نێوانیانەوە دەتوانێت وەڵام و پێشبینی زیاتر بەرهەم بهێنێت. ئەم قۆناغەیان وەک ڕاهێنانی رۆژانەی یاریزانێک وایە بۆئەوەی بەردەوام هەوڵبدات باشتر بێت.

**شەشەم: تاقیکردنەوە**

دوای پێدانی زانیاریی و فێرکردنی زیرەکی دەستکرد، ئێستا کاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیە بۆئەوەی بزانن هەتا چەند زیرەکی دەستکردەکە فێربووە (هەروەک چۆن خوێندکار فێردەکرێت دواتر تاقی دەکرێتەوە). زیرەکی دەستکرد بە کۆمەڵێ پرسیار و داواکاریی تاقیدەکرێتەوە کە پێشوتر پێی نەدراوە بۆئەوەی بزانن هەتا چەند توانای وەڵامدانەوەی هەیە، هەروەک چۆن خوێندکار لە پۆلدا نموونەیەکی فێردەکرێت و لە تاقیکردنەوە نمونەیەکی جیاوازتری بۆ دێتەوە. ئەگەر زیرەکی دەستکرد وەڵامەکانی هەڵەی تێدابوو یان لەتاقیکردنەوە دەرنەچوو، دووبارە ڕاهێنانی پێدەکرێتەوە هەتا دەگاتە باشترین ئاستی خۆی (وەک فێرکردنی قوتابییەک ئاستی باش نەبێت هەتا زیرەک دەبێت).

**حەوتەم: بڵاوکردنەوە**

دوای ئامادەکردنی زیرەکی دەستکرد لە هەموو لایەنەکانەوە، ئەم زیرەکی دەستکردە بڵاودەکرێتەوە و بەردەست دەخرێت بۆ بەکارهێنان.

**هەشتەم: بەردەوامی**

ئەم پرۆسانەی سەرەوە بەردەوام دەبن و قەبارەی زانیارییەکان بەردەوام زیاتر دەبن، فێرکردنەکە بەهێزتر دەکرێت و ئەنجامی باشتر بەدەستدەهێنرێت

تێبینی: سەیربکە تەنها بۆ ناسینەوەی یەک وێنە پێویستی بە چەندین زانیاری زۆر و ورد هەیە، ئەی ئەگەر ئەم زیرەکی دەستکردە لە چەند بوارێکی جیاوازدا بێت و وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە، دەبێت چەند ئاڵۆز بێت؟ هەربۆیە ئەم پرۆسەیە ئاسان نییە و زۆریش قورسە، تێچووی کۆکردنەوەی زانیاریی و هەڵگرتنیان و بەکارهێنانی کۆمپیوتەری ئاست بەرز بۆ بەرهەمهێنانی زیرەکی دەستکرد ملیارەها دۆلارە.

نمونەیەکی گشتگیر لەسەر فێرکردنی زیرەکی دەستکرد، وایدابنێ دەتەوێت بەرنامەیەک دروست بکەیت کە بتوانێت وێنەی پشیلە بناسێتەوە.

**هەنگاوی یەکەم:** کۆکردنەوەی زانیارییەکان

- خەزنکردنی هەزاران وێنەی پشیلە (هەتا وێنەکان زیاتر بن بەرنامەکەت زیرەکتر دەبێت)





- خەزنکردنی هەزاران وێنەی ئاژەڵانی تر کە پشیلە نین.

**هەنگاوی دووەم:** ئامادەکردنی زانیارییەکان

- دانانی ناو بۆ وێنەکا،ن ئەوانەی پشیلەن بنووسرێت (پشیلە) ئەوانەی پشیلە نین ناوی ئاژەڵەکە بنووسرێت یان بنووسرێت (پشیلە نیە).

- لابردنی وێنەی ناڕوون و ناپێویست.

**هەنگاوی سێیەم:** هەڵبژاردنی ئەلگۆریزم

دیاریکردنی ئەلگۆریزمێک کە بۆ ناسینەوەی وێنە بەکاردێت.

**هەنگاوی چوارەم:** پێدانی زانیارییەکان

- پێدانی ئەو هەزاران وێنەیە بە بەرنامەکە کە ئامادەمان کردووە.

- ئەلگۆریزمەکە وێنەکان وەردەگرێت و دەستدەکات بە شیکاریکردن بۆیان و جیاوازی نێوان پشیلە و ئاژەڵەکانی تر لە هەموو ڕووییەکەوە دەستنیشان دەکات

- بەرنامەکە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان پشیلە لەو وێنانەی پێیدراوە شیکار دەکات و ئەیانناسێتەوە.

**هەنگاوی پێنجەم:** تاقیکردنەوە

- وێنەیەکی پشیلەی پێدەرێت کە ئەو وێنەیەمان خەزن نەکردووە لە بەرنامەکەدا بۆئەوەی بزانین بەرنامەکە دەیناسێتەوە.

- پێدانی وێنەیەک کە کۆمەڵە ئاژەڵێکی تێدابێت بزانرێت دەزانێت کامە پشیلەیە و کامە پشیلە نیە.

- سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی زیرەکی دەستکردەکە بەندە بە ئاستی ناسینەوەکان بەوردی.

هەنگاوی شەشەم: چاکسازی

ئەگەر لەو وێنەیەدا ئاژەڵێک هەبوو نەیناسییەوە ئەوا مانای وایە زانیاری لەسەر ئەو جۆرە ئاژەڵە پێنەدراوە و دەبێت پێی بدرێت و دووبارە تاقیبکرێتەوە

هەنگاوی حەوتەم: بەردەوامی

دەبێت بەردەوام وێنەی نوێی پشیلە و ئاژەڵەکانی تریشی پێ بدەیت بۆئەوەی زیاتر پێشبکەوێت.

## چۆن زیرەکی دەستکرد لە نووسین و دەنگی مرۆڤ تێدەگات؟

دوای ئەوەی باسی ئەوەمانکرد زیرەکی دەستکرد چۆنڕرادەهێنرێت، کاتی ئەوەیە لە ئێمە تێبگات، وەڵامی پرسیار و داواکاریەکانمان بداتەوە.

تێگەیشتن لە مرۆڤ لە ڕێگەی شیکارکردنی زمانی سروشتی مرۆڤ (NLP) تەکنۆلۆژیای (Natural language processing (NLP بەشێکی سەر بە کۆمپیوتەر و زیرەکی دەستکردە، ئەرکی ئەوەیە یارمەتی کۆمپیوتەر و ئامێرە دیجیتاڵییەکان بدات تاوەکو لە مرۆڤ تێبگەن و کارلێکی لەگەڵ بکەن، NLP لە ناسینەوەی دەنگ، وەرگێڕان، پرسیار و وەڵام، دەرهێنانی زانیاری سودبەخش و مانادار لە نووسیندا بەکاردێت.

## هەنگاوەکانی NLP بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ:

١- دابەشکردن (Tokenization): مرۆڤ داواکارییەکەی لەڕێگەی نووسین یان دەنگەوە دەدات بەزیرەکی دەستکرد و ئەویش سەرجەم وشەکانی ناو نووسینەکە جیادەکاتەوە، واتە نووسینەکە دەکات بە (وشە وشە). ئەگەر داواکارییەکە دەنگ بێت سەرەتا دەنگەکە دەکات بەتێکست و پاشان دابەشی دەکات.

٢- لابردنی وشەی زیادە: زیرەکی دەستکرد چەند کردارێکی ڕێزمانی دیکە بەسەر ئەم نووسینەدا ئەنجامدەدات وەک لابردنی وشە زیادەکان، کە وەک ئامرازی پەیوەندی یان فاریزە و وەستان لە ڕستەدا بەکارهاتوون، پاشان جیاکردنەوەی وشەکان لەسەر بنەمای (ناو، فرمان، ئاوەڵناو ... هتد)، دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان وشەکان وەک (مرۆڤ، تەنەکان، شوێن، ڕێکخراوەکان، بەروار ... هتد).

٣- ماناسازی: زیرەکی دەستکرد هەوڵدەدات لەسەر بنەمای ئەو نووسینەی پێیدراوە لە مانای وشە دابەشکراوەکان تێبگات، کە ئەمە خۆی دەبینێتەوە لە پێناسەی وشەکە و چۆنیەتی بەکارهێنان و وشە هاوشێوەکانی (مورادیف).

٤- شیکاری ڕستەسازی: دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان وشەکان، کە چۆن لە ڕستەیەکدا پێکەوە دەگونجێن بۆئەوەی لە ماناکەی تێبگات.

٥- شیکاری پراگماتیکی: زانینی مەبەستی مرۆڤ لە بەکارهێنانی ئەو وشانە لەو ڕستەدا (مانای پشت وشەکان).





٦- وەرگرتنی زانیاری: دوای ئەوەی زیرەکی دەستکرد هەموو لایەنەکانی نووسینەکەی شیکار کرد و تێگەیشت لە داواکارییەکە، بەپشتبەستن بەو زانیارییە زۆرەی کە لە قۆناغی فێرکردندا پێی دراوە یان لە ڕێگەی گەڕانەوە، زانیاری پەیوەندیدار بە داواکارییەکە وەردەگرێت.

٧- دروستکردنی وەڵام: بە پشتبەستن بە زانیارییە وەرگیراوەکان زیرەکی دەستکرد وەڵامی وشە بە وشەی ڕستەکە ئامادە دەکات، چونکە ناتوانێت بەیەکجار وەڵامەکە ئامادە بکات، پاشان لە ڕێگەی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان وشەکانەوە وەڵامی کۆتایی بۆ داواکارییەکە ئامادە دەکات. ئەگەر مرۆڤەکە ویستی بەشێوازی دەنگ وەڵامەکە وەربگرێت ئەوا نووسینەکەی بۆ دەخاتەوە سەر شێوازی دەنگ. پێش ئەوەی وەڵامەکە بداتەوە بەمرۆڤ زیرەکی دەستکرد پشکنین بۆ سەرجەم زانیارییەکان دەکات بۆئەوەی دڵنیابێتەوە زانیارییەکان یاسا شکێنی و توندوتیژی تێدا نەبێت.

٨- هەڵسەنگاندن: دوای ئەوەی وەڵامی داواکارییەکەی دایەوە، زیرەکی دەستکرد وەڵامەکەی خۆی هەڵدەسەنگێنێت لەسەر بنەمای پەیوەندی نێوان داواکاریی و وەڵامەکە، هەروەها ڕای ئەو مرۆڤەش کە داواکارییەکەی کردووە کە دەتوانێت پێی بڵێت وەڵامەکەت دروستە یاخود نا، ئەگەر پێویستی کرد دەتوانێت کەموکوڕییەکان چاک بکات و دووبارە لیستێکی دیکە ئامادە بکات.

## نمونەیەکی گشتگیر:

داواکاری مرۆڤ لە زیرەکی دەستکرد:

تکایە دەتوانیت لە نزیک مزگەوتی گەورە چێشتخانەیەکی باش پێشنیاز بکەیت؟ کاردانەوەی زیرەکی دەستکرد بۆ داواکارییەکەی ئێمە:

١- دابەشکردن (Tokenization)

(تکایە)، (دەتوانیت)، (لە نزیک)، (مزگەوتی)، (گەورە)، (چێشتخانەیەکی)، (باش)، (پێشنیاز)، (بکەیت).

٢- لابردنی وشە ناپێویستەکان: دوای لابردنی وشە ناپێوستەکان و ڕێکخستنەوەیان بەم شێوەیەی لێدێت:

(چێشتخانە)، (باش) ، (پێشنیاز)، (لە نزیک)، (مزگەوتی)، (گەورە).

٣- تێگەیشتنی لە مانای وشەکان:
- چێشتخانە: شوێنێکە خەڵک نانی تێدا دەخۆن و پارە دەدەن.
- مزگەوتی گەورە: شوێنێکی ئاینی دیاریکراوە.
- لە نزیک: ئاماژەیە بۆئەوەی لەم ڕستەیەدا چێشتخانە و مزگەوتی گەورە پەیوەندییان پێکەوە هەیە.
٤- شیکاری ڕستەسازی: زیرەکی دەستکرد تێدەگات کە:
- کۆی مانای ئەم ڕستەیە داوای زانیاری دەکات.
- بەکارهێنانی وشەی (نزیک) ئاماژەیە بۆئەوەی کە پرسیارەکە لەسەر بنەمای شوێنە.
٥- شیکاری پراگماتیکی: زیرەکی دەستکرد مەبەستەکانی داواکارییەکە شیدەکاتەوە:
- کەسی پرسیارکەر بەدوای چێشتخانەیەک دەگەڕێت شوێنێکی دیاریکراو (مزگەوتی گەورە).
- بەکارهێنانی وشەی (باش) مانای وایە کەسەکە بەدوای چێشتخانەیەک دەگەڕێت کوالێتی باش بێت.
٦- وەرگرتنی زانیاری: ناوی ئەو چێشتخانانە وەردەگرێت کە لە نزیک مزگەوتی گەورەن.
٧- ئامادەکردنی وەڵام: زیرەکی دەستکرد وەڵامەکە بەشێوازێک ئامادە دەکات کە مرۆڤ لێی تێبگات و لیستی ناو و ناونیشانی چێشتخانەکان دەدات بە داواکارەکە.
٨- هەڵسەنگاندن:
هەڵسەنگاندن بۆ وەڵامەکە دەکات.



## گرفتەکان:

بەهۆی جیاوازی مرۆڤ لە شێوازی نووسین و دەربڕین و ڕێزمانی و ناڕوونی داواکارییەکانیان، تێگەیشتن لە مرۆڤ و مەبەستەکانی بۆ زیرەکی دەستکرد بەتەواوی کارێکی ئاڵۆز و سەختە، ئەمە جگەلەوەی هەبوونی چەند مانایەک بۆ یەک وشە گرفتێکی دیکەیە، هەروەها بەردەوام گۆڕانکاری لە زمانی مرۆڤ و مەبەستی بەکارهێنانیدا دەکرێت، هەربۆیە چەندین تەکنیکی ورد و ئاڵۆز بۆ چارەسەری ئەم کێشانە بەکاردەهێنن کە باسکردنیان لێرە بۆ کەسانێک پسپۆڕ نەبن سودێکی ئەوتۆی نییە.

## گشتاندن:

ئەو داواکارییەی لە زیرەکی دەستکرد دەکرێت، هەرچۆن بێت بەم هەنگاوانە دەتوانێت وەڵامی خۆی ئامادە بکات.

بۆ نموونە دەکرێت داوای نووسینی بابەت لە زیرەکی دەستکرد بکەیت لەسەر تێکچوونی ژینگە یان داڕشتنی هەواڵێک لەسەر بابەتێکی دیاریکراو یان نووسینی تێکستی ڕێکلام و هەر شتێکی دیکە بەبیری تۆدا دێت.

تێبینی: لەڕووی زانستییەوە ئەمە هەنگاوەکان بوو، دەکرێت جیاوازی بچووک لە کۆمپانیایەکەوە بۆ کۆمپانیایەکی دیکە هەبێت بەپێی ئەلگۆریزم و مۆدیۆڵە بەکارهاتووەکان.





راز عەزیز ئەحمەد
ماستەر لە زمانەوانی گشتی ئینگلیزی، زانکۆی ڕاپەڕین

# ڕۆڵی ژیریی دەستکرد

## لە وەرگێڕانی دەق و نووسینەکاندا چییە؟

لە دونیای ئەمڕۆدا، کە زانیاری زۆر بەخێرایی ئاڵوگۆڕ دەکرێت، چەمکی وەرگێڕان گرنگییەکی بەرچاوی بۆ دروستبووە و هەیە. توانای گواستنەوەی چەمکەکان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر نەک تەنها سنووری زمانەوانییەکان ناهێڵێت، بەڵکو وەک پردی پەیوەندیکردن لە بواری زانستیی و کولتووریی و ئابووریشدا کاردەکات. هاوکات پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و سەرهەڵدانی ژیریی دەستکرد گۆڕانکارییەکی بەرچاوی لە چەمک و پرۆسەی وەرگێڕاندا کردووە. زیرەکی دەستکرد لە ئێستادا بووەتە یەکێک لە ئامرازە سەرەکییەکانی بواری وەرگێڕان و توانیویەتی پێگەیەکی گرنگ لەم بوارەدا بەدەستبهێنێت.

ئەم بابەتە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ ڕۆڵی زیرەکی دەستکرد لە وەرگێڕانی دەق و کاریگەرییەکانی لەسەر ئەم بوارەدا دەکات، لەهەمانکاتدا شیکاری ئەو سود و ئاڵنگارییانە، یاخود بەرهەڵستییانە دەکات، کە وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد ڕووبەڕووی دەبنەوە.

## - چەمکی وەرگێڕی ژیریی دەستکرد:

وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد ئەو سیستەمەن، کە توانای وەرگێڕانی دەقەکانیان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر هەیە بە بەکارهێنانی ئەلگۆریتمەکانی فێربوونی ئامێر و پرۆسێسی زمانی سروشتی. ئەم وەرگێڕانانەی ژیریی دەستکرد بۆ فێربوون و باشترکردنی کوالێتی وەرگێڕانەکانیان، داتا گەورەکان و تۆڕە دەمارییەکان بەکاردەهێنن. بەپێچەوانەی وەرگێڕانی مرۆڤ، کە لەسەر بنەمای تێگەیشتنی زمانەوانیی و کولتووری کاردەکەن، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد لەسەر بنەمای نەخش و داتای ئاماری کاردەکەن و بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەقەکان وەردەگێڕن.

سەرەتا، وەرگێڕانی ئامێر تەکنیک و شێوازی وەرگێڕانی تەقلیدییان بەکارهێناوە، کە لەسەر بنەمای یاسا زمانەوانییەکان دامەزراون؛ بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی ژیریی دەستکرد، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد گۆڕاون و وەرگێڕانەکان لەسەر بنەمای فێربوونی قوڵ و تۆڕە دەمارییەکان بوون. ئەم پێشکەوتنە ڕێگەیان پێدەدات بە تێپەڕبونی کات کوالێتی وەرگێڕانەکانیان باشتر بکەن. بۆ نموونە سیستەمی وەرگێڕانی وەک گوگڵ ترانسلێت(Google Translate) و دیپڵ(DeepL) ئەم تەکنەلۆژیایە بەکاردەهێنن و توانیویانە تواناکانیان بەرەو ئاستێک پێشبخەن، کە لە زۆر حاڵەتدا نزیکە لە وەرگێڕانی مرۆڤەوە.

## * سودەکانی بەکارهێنانی وەرگێڕی ژیریی دەستکرد(AI):

وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد سودی یەکجار زۆر بۆ بەکارهێنەران و ڕێکخراوەکان دەهێنن. ئەم سودانە بوونەتە هۆی ئەوەی، کە ئەم ئامرازانە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ژینگەی پیشەیی و ڕۆژانەدا بەکاربهێنرێن. لە خوارەوە باس لە هەندێک لەم سودانە دەکەین:

**١- خێرایی زۆر(خێرایی باڵا):**

یەکێک لە گرنگترین سودەکانی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد خێرایی زۆری وەرگێڕانی دەقەکانە. لەکاتێکدا وەرگێڕانی مرۆڤ پێویستیان بە کاتێکی زۆرە بۆ وەرگێڕانی دەقەکان، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد توانای وەرگێڕانی دەقی درێژیان هەیە لە کەمترین چرکەدا. ئەم تایبەتمەندییە بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا بەسودە، کە پێویستت بە وەرگێڕانی بەپەلە و خێرا هەیە.

**٢- تێچووی کەمتر:**

بەکارهێنانی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد تێچووی وەرگێڕان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمدەکاتەوە. لەکاتێکدا وەرگێڕانی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی کرێی زیاتر وەردەگرن بۆ وەرگێڕانی دەقەکان، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد بە کرێیەکی زۆر کەمتر، یان تەنانەت بەخۆڕایی بەردەستن. ئەمەش یارمەتی کۆمپانیا و تاکەکان دەدات پارە پاشەکەوت بکەن وەک لەوەی لە وەرگێڕانی دەقەکانیان بۆ مرۆڤ خەرجی بکەن.

**٣- بەئاسانی دەستگەیشتن پێیان:**

وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد بەشێوەیەکی بەرفراوان بەردەستن و بەکارهێنەران دەتوانن لەهەر کاتێکدا و لەهەر شوێنێک بەکاریان بهێنن. ئەم ئامرازانە بەزۆری بەشێوەی ئۆنلاین، یان لەڕێگەی ئەپی مۆبایلەوە دەستیان پێدەگات و پێویستیان بە ئامێر و کاڵای تایبەت نییە. ئەم تایبەتمەندییە ڕێگە بە بەکارهێنەران دەدات لەهەر کاتێکدا دەقەکانیان وەربگێڕن بەبێ ئەوەی پێویستیان بە پەنابردنە بەر وەرگێڕی مرۆیی هەبێت.

**٤- پشتگیری بۆ زمانە جیاوازەکان:**

یەکێک لە سودە گرنگەکانی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد توانای وەرگێڕانی دەقەکانە بۆ زمانی جیاواز. زۆرێک لە وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد پشتگیری لە چەندین زمان دەکەن، بەکارهێنەرانیش دەتوانن دەقەکانیان وەربگێڕن بۆ زمانی جیاواز. ئەمەش بەتایبەتی لە ژینگەی فرەزمان و نێودەوڵەتییەکاندا گرنگە.

**٥- باشترکردنی بەردەوامی کوالێتی وەرگێڕان:**

بە بەکارهێنانی ئەلگۆریتمەکانی فێربوونی قوڵ و شیکاری داتا گەورەکان،

وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد بەردەوام کوالێتی وەرگێڕانەکانیان باشتر دەکەن. ئەم ئامرازانە هەر جارێک، کە بەکاردەهێنرێن لە داتا نوێیەکانەوە فێردەبن و دەتوانن وەرگێڕانی وردتر پێشکەش بکەن. ئەم پرۆسەی خۆفێربوونە ڕێگە بە وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد دەدات، کە وەرگێڕانێک بەدەستبهێنن، کە بە تێپەڕبونی کات لە وەرگێڕانی مرۆڤەوە نزیکبن.

## - بەرهەڵستییەکان بۆ وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد:

سەرەڕای سودە زۆرەکانیان، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد هێشتا ڕووبەڕووی ئاستەنگ و بەرهەڵستی دەبنەوە، کە کاریگەرییان لەسەر کوالێتی و وردی وەرگێڕانەکانیان هەیە. ئەم بەرهەڵستییانە ڕەنگە بەومانایە بێت، کە هێشتا لە هەندێک حاڵەتدا وەرگێڕانی مرۆڤ بەباشتر دەزانرێت. لە خوارەوە باسی هەندێک لەو بەرهەڵستیانە دەکەین:

**١- نەبوونی تێگەیشتنی زمانەوانی و کولتووری:**

یەکێک لە گەورەترین ئاستەنگەکان بۆ وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد، نەبوونی تێگەیشتنی زمانەوانی و کولتوورییە. وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد لەسەر بنەمای داتا و ئەلگۆریتمەکانی ئاماری کاردەکەن و توانای تێگەیشتنێکی قوڵیان لە چەمکە کولتووریی و زمانەوانییەکان نییە. لەکاتێکدا وەرگێڕانی مرۆڤ دەتوانن بە لەبەرچاوگرتنی چوارچێوەی کولتووریی و زمانی دەقەکە وەرگێڕانی ورد و گونجاو پێشکەش بکەن، بەڵام وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد لە هەندێک حاڵەتدا ڕەنگە وەرگێڕانی هەڵە یان نەگونجاویان لێبکەوێتەوە.

**٢- زەحمەتی وەرگێڕانی دەقی هونەریی و ئەدەبی:**

وەرگێڕانی دەقی هونەریی و ئەدەبی یەکێکە لە بوارە ئاڵۆزەکانی وەرگێڕان. لەمجۆرە دەقەدا، نەک هەر دەبێت مانای وشەکان بە دروستی بگەیەنرێت، بەڵکو دەبێت هەست و سۆز و شێوازی نووسەر و جوانی زمانەکەش بپارێزرێت. بەهۆی سنورداربوونیان لە تێگەیشتن لەم لایەنانە، وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد ناتوانن وەرگێڕانی هونەریی و ئەدەبی کوالێتی بەرز پێشکەش بکەن. هەر لەبەر ئەم هۆکارە هێشتا لەم بوارانەدا وەرگێڕانی مرۆڤ بەباشتر دەزانرێت.

**٣- پێویستی بە دەستکاریکردنی مرۆڤ هەیە:**

سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە زۆرانەی کە وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد بەدەستیانهێناوە، بەڵام وەرگێڕانەکانیان هێشتا پێویستیان بە دەستکاریکردنی وەرگێڕانی مرۆڤ هەیە، بەتایبەتی لە دەقە هەستیار و تایبەتمەندەکاندا گرنگە. لە زۆر حاڵەتدا بۆ دڵنیابوون لە وردی و دروستی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد پێویستی بە پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوە هەیە.

**- ڕۆڵی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد لە داهاتووی وەرگێڕان:**

بەلەبەرچاوگرتنی بەرزبوونەوەی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیا، چاوەڕوان دەکرێت وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد لە داهاتوودا ڕۆڵێکی زیاتر لە پیشەسازی وەرگێڕاندا، بگێڕن. بەتێپەڕبونی کات ئەم ئامرازانە دەتوانن وەرگێڕانی وردتر و کوالێتی بەرزتر پێشکەش بکەن و وەک ئامرازێکی یارمەتیدەر شانبەشانی وەرگێڕانی مرۆڤایەتی کاربکەن.

**- تێکەڵکردنی وەرگێڕانی مرۆڤ و ژیریی دەستکرد:**

یەکێک لە سیناریۆ پێشبینیکراوەکان بۆ داهاتووی وەرگێڕان، تێکەڵکردنی وەرگێڕانی مرۆڤ و ژیریی دەستکردە. لەم سیناریۆیەدا وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد وەک ئامرازێکی یارمەتیدەر بەکاردەهێنرێن بۆ ئەنجامدانی وەرگێڕانی سەرەتایی، پاشان وەرگێڕە مرۆییەکان بە پێداچوونەوە و دەستکاریکردنی ئەم وەرگێڕانە کوالێتی کۆتایی مسۆگەر دەکەن. ئەم پێکەوەگرتنە دەتوانێت ببێتە هۆی زیادبوونی خێرایی و وردی وەرگێڕان و کەمبوونەوەی تێچوونەکان.

**- باشترکردنی وەرگێڕانی تایبەتمەند:**

بە پێشکەوتنی زیاتر لە فێربوونی قوڵ و پرۆسێسی زمانی سروشتی، پێشبینی دەکرێت وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد بتوانن لە داهاتوودا وەرگێڕانی تایبەتمەندتر پێشکەش بکەن. بە فێربوون لە داتا تایبەتمەندەکان لە بوارە جیاوازەکاندا، ئەم ئامرازانە دەتوانن وەرگێڕانی وردتر بە زاراوەی تایبەتمەندی گونجاو پێشکەش بکەن.

- وەرگێڕانی هاوکات:

یەکێک لە بەکارهێنانە سەرنجڕاکێشەکانی داهاتووی وەرگێڕانی ژیریی دەستکرد وەرگێڕانی هاوکاتە. ئەم تەکنەلۆژیایە ڕێگە بە بەکارهێنەران دەدات، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەیەک کاتدا گفتوگۆکانیان بۆ زمانە جیاوازەکان وەربگێڕن. ئەمەش دەتوانێت لە ژینگە فرەزمانیی و نێودەوڵەتییەکانی وەک کۆنفرانس و کۆبوونەوە بازرگانییەکان زۆر بەسود بێت، یارمەتیدەرە بۆ باشترکردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

- زیادکردنی دەستڕاگەیشتن بە زانیاری:

وەرگێڕانەکانی ژیریی دەستکرد دەتوانن، بە تێپەڕبوونی کات، یارمەتیدەربن لە زیادکردنی دەستڕاگەیشتن بە زانیارییەکان لە سەرانسەری جیهاندا. بە توانای وەرگێڕانی ئۆتۆماتیکی و خێرای دەقەکان بۆ زمانە جیاوازەکان، بەکارهێنەرانی جیهان دەتوانن دەستیان بگات بەو زانیارییانەی، کە بە زمانەکانی دیکە پێشکەش دەکرێن و سودیان لێوەربگرن. ئەمەش بەتایبەتی لە بوارەکانی زانستی و توێژینەوەدا گرنگە و دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە ئاڵوگۆڕی زانست و زانیاری لەسەر ئاستی جیهانی.

## ئەنجام:

وەرگێڕانەکانی ژیریی دەستکرد ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە گۆڕینی پیشەسازی وەرگێڕان و بوونەتە یەکێک لە ئامرازە بەربڵاوەکان لەم بوارەدا. ئەم ئامرازانە بە دابینکردنی وەرگێڕانی خێرا و هەرزان و دەستڕاگەیشتن، پێگەیەکی تایبەتیان لەنێو بەکارهێنەران و ڕێکخراوەکاندا بەدەستهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەرگێڕانەکانی ژیریی دەستکرد هێشتا ڕووبەڕووی ئاستەنگ دەبنەوە، لەوانە تێگەیشتنی زمانەوانیی و کولتووری، وەرگێڕانی دەقی هونەریی و ئەدەبی و وەرگێڕانی زاراوەی تایبەت. هەر لەبەر ئەم هۆکارە لە زۆر حاڵەتدا پێویستی بە دەستکاریکردن و پێداچوونەوە لەلایەن وەرگێڕانی مرۆڤەوە هەیە.

لە داهاتوودا بە پێشکەوتنی زیاتر لە بواری ژیریی دەستکرد و پرۆسێسکردنی زمانی سروشتیدا، پێشبینی دەکرێت وەرگێڕانەکانی ژیریی دەستکرد بتوانن وەرگێڕانی وردتر و کوالێتی بەرزتر بەدەستبهێنن و وەک ئامرازێکی یارمەتیدەر شانبەشانی وەرگێڕانی مرۆیی کاربکەن. ئەم پێکەوەگرتنە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە باشترکردنی کوالێتی وەرگێڕانەکان و زیادکردنی خێرایی و کەمکردنەوەی تێچوونەکان لەم بوارەدا.




# گفتوگۆی «خاڵ» لەگەڵ AI

## لە ناوەندی کوردی کارەکانمان لە قۆناغی سەرەتادایە و فرەیی شێوەزارەکانی زمان کێشەیە لە بەردەمماندا

ئەمڕۆ جیهان بە شۆڕشێکی تەکنیکی بێ وێنەدا گوزەر دەکات بە سەرکردایەتی سیستەمی زیرەکی دەستکرد. هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا ئەم تەکنیکە کۆمەڵێك ئاڵنگاری ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتی دەوروژێنێت سەبارەت بە تایبەتمەندی و بەهاکان و داهاتووی هاوبەشمان. لەم گفتوگۆیەدا «خاڵ» لە ڕێگەی «chatgpt» ییەوە گفتوگۆی لەگەڵ پسپۆڕێکی زیرەکی دەستکردی کرد، سەبارەت بەوەی ئەم تەکنەلۆژیایە چییە و سوودەکانی و زیانەکانی چین؟ هەروەها باس لەبارەی بەردەستبوونی تەکنۆلۆژیای زیرەکی دەستکرد بە زمانی کوردی و توانای خزمەتکردنی کۆمەڵگە لە هەرێمی کوردستانی گفتوگۆمان کرد لەگەڵ پێشبینییە ئایندەییەکانی داهاتووی ئەم تەکنەلۆژیایە لە کوردستاندا، ئەمەش دەقی گفتوگۆکەیە:

**ئا: خاڵ**

**+ پێمان خۆشە دیالۆگێک لەگەڵتان بکەینەوە سەبارەت بە زیرەکی دەستکرد و لێکەوتەکانی بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی لە گۆڤاری «خاڵ»، کە وەرزنامەیەکی هزریی و ڕۆشنبیرییە و لە هەرێمی کوردستانی عێراق بڵاودەکرێتەوە. دەتوانن یارمەتیمان بدەن لەوبارەیەوە؟**

_ بێگومان بە خۆشحاڵییەوە یارمەتیتان دەدەم لە سازکردنی دیالۆگ و وەڵامدانەوەی پرسیارەکان. سەرەتا بە پرسیارکردن، یان دەستنیشانکردنی ئەو بابەتانە دەستپێبکە کە دەتەوێت قسەیان لەبارەوە بکەین.

**+ سەرەتا لەوەوە دەستپێبکەین، پێناسەی تۆ بۆ ژیری دەستکرد چییە؟**

_ ژیری دەستکرد (AI) لقێکی زانستی کۆمپیوتەرە، کە ئامانجی پەرەپێدانی سیستەم و ئەو نەرمەکاڵایانەیە کە توانای ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی هەیە کە پێویستیان بە زیرەکی مرۆڤ هەیە، وەک فێربوون، بڕیاردان، چارەسەرکردنی کێشەکان، ناسینەوەی نەخشەکان و چارەسەرکردنی زمانی سرووشتی. تەکنەلۆژیاکانی زیرەکی دەستکرد پشت بە ئەلگۆریتمەکانی پێشکەوتوو و شیکاری داتا گەورەکان دەبەستن، ئەمەش وایان لێدەکات بتوانن بە تێپەڕبوونی کات لە ڕێگەی فێربوونی بەردەوامەوە کارەکانیان باشتر بکەن.

**+ کۆمپانیاکان هەتا چەند پێشکەوتوون کە لە بواری زیرەکی دەستکرددا کاردەکەن و بە دیاریکراوی کامانەن؟**

_ لە ساڵانی ڕابردوودا جیهان شایەتی زیادبوونی بەرچاوی ئەو کۆمپانیایانە بووە کە لە بواری زیرەکی دەستکردا کار دەکەن. هەزاران کۆمپانیا لە سەرانسەری جیهاندا هەن، لە کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆژیاوە هەتا دەستپێشخەری داهێنەرانە، دەتوانرێت پۆلێن بکرێت بۆ:

١_ کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆجیا: وەک گووگڵ، مایکرۆسۆفت، ئەمازۆن، مێتا (پێشتر فەیسبووک بوو) و ئەپڵ)، کە خزمەتگوزاری پێشکەوتووی زیرەکی دەستکرد پێشکەش دەکەن و تێکەڵیان دەکەن بە بەرهەمەکانیان.

٢_ ستارتاپ: گرنگیدان بە بەرنامە تایبەتەکان، وەک باشترکردنی چاودێری تەندروستی، ئۆتۆمبێلی خۆ لێخوڕین، یان ڕۆبۆتیک دەدات.

٣_ کۆمپانیاکانی بواری پیشەسازی: کاریان بەکارهێنانی زیرەکی دەستکردە

بۆ باشترکردنی بەرهەمهێنان لە کەرتەکانی وەک بەرهەمهێنان، کشتوکاڵ، خزمەتگوزاریی و دارایی. بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەم دواییە، لە سەرانسەری جیهاندا زیاتر لە ١٠ هەزار کۆمپانیا لە بواری زیرەکی دەستکرددا کاردەکەن و ئەو کۆمپانیایانە بەشێوەیەکی سەرەکی لە نێوان ئەمریکا و چین و ئەوروپادا دابەشبوون، ئەمە جگەلە زیادبوونی خواست بۆ کارکردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیا.

**+ زیرەکی دەستکرد چی پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکات؟**

زیرەکی دەستکرد یەکێکە لە تەکنەلۆژیا کاریگەرەکان لە ئێستا و داهاتووی مرۆڤایەتیدا. دەتوانێت سوودی زۆر دەستەبەربکات لەڕێگەی باشترکردنی ژیانی خەڵک و زیادکردنی بەرهەمهێنان و پاڵپشتیکردنی بڕیاردان. لێرەدا گرنگترین ئەو بوارانە دەخەینەڕوو کە دەکرێت جیهان سوودیان لێ ببینێت بەهۆی ژیری دەستکردەوە:

١_ باشترکردنی چاودێری تەندروستی لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

• دەستنیشانکردنی پێشوەختە: ئەویش لە ڕێگای بەکارهێنانی ژیری دەستکرد بۆ شیکردنەوەی وێنەکانی تیشک و تۆمارە پزیشکییەکان، کە یارمەتیدەرە بۆ دیاریکردنی نەخۆشییەکانی وەک شێرپەنجە و نەخۆشییەکانی دڵ لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا.

• نوژداری کەسێتی: دابینکردنی چارەسەری کەسی بۆ هەر نەخۆشێک بە پشتبەستن بە زانیارییە بۆماوەیی و دۆسییە پزیشکییەکانی.

• خێراکردنی توێژینەوەی پزیشکی: خێراکردنی دۆزینەوەی دەرمانی نوێ و کەمکردنەوەی کات و تێچووی دارایی تاقیکردنەوە کلینیکییەکان.

٢_ باشترکردنی پەروەردە لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

• سیستەمی فێربوونی زیرەک: پلاتفۆرمی فێربوونی کەسی لەسەر بنەمای توانا و ئارەزووەکانی خوێندکار.

• دەستڕاگەیشتنێکی زیاتر بە زانیاری: دابینکردنی پەروەردەی کوالێتی بەرز بۆ ناوچە دوورەکان بە بەکارهێنانی ئامرازە پەروەردەییەکان لەسەر بنەمای ژیری دەستکرد.

• ئامادەکردنی کارامەییەکانی داهاتوو: ڕاهێنانی خوێندکاران بۆ ئەو کارانەی کە ڕەنگە لە داهاتوودا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە دەربکەون و سەرهەڵبدەن




**ژیری دەستکرد (AI) لقێکی زانستی کۆمپیوتەرە، ئامانجی پەرەپێدانی سیستەم و ئەو نەرمەکاڵایانەیە توانای ئەنجامدانی ئەوئەرکانەی هەیەکەپێویستیان بە زیرەکی مرۆڤ هەیە، وەك فێربوون، بڕیاردان، چارەسەرکردنی کێشەکان، ناسینەوەی نەخشەکان و چارەسەرکردنی زمانی سرووشتی.**

٣_ بەرزکردنەوەی بەرهەمی ئابووری لەم ڕێگایانەوە:

• کشتوکاڵی زیرەک: باشترکردنی بەرهەم و کەمکردنەوەی بەکارهێنانی سەرچاوەکان بە بەکارهێنانی تەکنیکەکانی ژیری دەستکرد بۆ شیکردنەوەی خاک و کەشوهەوا.

• پیشەسازی: بەڕێوەبردنی هێڵی بەرهەمهێنانی کاراتر و کەمکردنەوەی پاشماوە بە بەکارهێنانی ڕۆبۆت.

• خزمەتگوزارییە داراییەکان: بەرزکردنەوەی ئاسایشی دارایی و پەرەپێدانی ئامرازەکانی شیکاری و پێشبینیکردنی ئابووری.

٤_ باشترکردنی ژیانی ڕۆژانە لەم ڕێگایانەوە:

• یاریدەدەری کەسی مەجازی: وەک ئەلێکسا و سیری، کە ژیانی مرۆڤەکان ڕێکخراوتر و کاراتر دەکەن.

• گواستنەوەی زیرەک: ئۆتۆمبێلی خۆلێخوڕ کە ڕەنگە ڕووداوەکان کەمبکاتەوە و قەرەباڵغی هاتوچۆ کەمبکاتەوە. بازاڕکردنی کەسی: پێشنیازکردنی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان کە لەگەڵ ئارەزووەکانی بەکارهێنەران بگونجێت

٥_ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگە جیهانییەکان لەم ڕێگایانەوە:
• گۆڕانی کەشوهەوا: شیکردنەوەی داتای گەورە بۆ پێشبینیکردنی گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا و پەرەپێدانی چارەسەری بەردەوام.
• قەیرانە مرۆییەکان: باشترکردنی ئۆپەراسیۆنەکانی فریاگوزاری، وەک دابەشکردنی سەرچاوەکان لەکاتی کارەساتی سرووشتیدا.
• بەرەنگاربوونەوەی برسێتی: باشترکردنی بەرهەمهێنانی خۆراک و دابەشکردنی دادپەروەرانە.
+ ئاڵنگارییە ئەخلاقییەکانی بەکارهێنانی ژیری دەستکرد چین؟
_ سەرەڕای سوودە بەرچاوەکانی، گرنگە بە وریاییەوە لە AI نزیک ببینەوە، بەتایبەت سەبارەت بە تایبەتمەندی، لایەنگری ئەلگۆریتم و گۆڕینی کارەکانی مرۆڤ و جێگرتنەوەی مرۆڤ بە تەکنیك. هەربۆیە دەبێت ئەم سوودانە چوارچێوەیەکی ئەخلاقی بەهێزی لەگەڵدا بێت کە دڵنیابێت لەوەی کە AI بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و بەرپرسیارانە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات.

**+ ئەی لایەنە نەرێنییەکانی ژیری دەستکرد چین؟**

سەرەڕای ئەو سوودە زۆرانەی کە ژیری دەستکرد پێشکەشی دەکات، بەڵام ئاڵنگاریی و کەموکوڕیشی لەگەڵدایە کە پێویستە بە جددی چارەسەر بکرێن بۆ دڵنیابوون لەوەی کە تەکنەلۆژیا نوێیەکان سوودبەخش و سەلامەتن بۆ مرۆڤایەتی. لێرەدا گرنگترین لایەنە نەرێنییەکان دەخەینەڕوو کە ڕەنگە ژیری دەستکرد ببێتە هۆی:
١_ لەدەستدانی کار و جێگرتنەوەی کاری مرۆیی ئەویش لە دوو ڕێگاوە:
• ژیری دەستکرد و ڕۆبۆتەکان دەتوانن جێگەی مرۆڤ بگرنەوە لە زۆرێک لە کارە تەقلیدییەکاندا، وەک بەرهەمهێنان و گواستنەوە و خزمەتگوزاری. ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی زیادبوونی بێکاری، بەتایبەتی لەنێو ئەو گرووپانەی کە پشت بە کارە کەم لێهاتووییەکان دەبەستن.
• گۆڕانکاری خێرا لە بازاڕی کاردا ڕەنگە زۆرێک لە کرێکاران ئامێری پێویستیان نەبێت بۆئەوەی خۆیان لەگەڵ کارەکانی داهاتوودا بگونجێنن.
٢_ لایەنگری و نادادپەروەری: سیستەمی AI پشت بە داتا دەبەستێت

بۆ فێربوون و بڕیاردان. ئەگەر ئەم داتایانە لایەنگری یان ناهاوسەنگ بن، لەوانەیە ببێتە هۆی بڕیاری جیاکاری یان نادادپەروەرانە، بۆ نموونە سیستەمی دامەزراندنی کارمەند دەتوانێت لایەنگری لە دژی ڕەگەزێک یان ڕەگەزێکی دیاریکراو نیشانبدات ئەگەر پشت بە داتای مێژوویی ناهاوسەنگ ببەستێت.

٣_ مەترسی لەسەر تایبەتمەندی ئەویش لە دوو ڕێگاوە:

• ژیری دەستکرد پشت بە شیکردنەوەی بڕێکی زۆر لە زانیاری کەسی دەبەستێت، ئەمەش نیگەرانییەکان لەبارەی سیخوڕیکردن، چاودێریکردن و بەکارهێنانی زانیارییەکان دەوروژێنێت و باوەڕ وایە نهێنی تاکەکان پێشێل دەکات

• دەتوانرێت داتاکان بەشێوەیەکی نائەخلاقی بەکاربهێنرێت، وەک ئامانجکردنی تاکەکان بە ڕێکلام یان تەنانەت دەستکاریکردنی بۆچوونە سیاسییەکانیان.

٤_ سەلامەتی و بەکارهێنانی مەترسیدار: پەرەپێدانی ژیری دەستکرد دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ پەرەپێدانی سیستەمی چەکی سەربەخۆ، ئەمەش مەترسییەکانی شەڕ زیاد دەکات کە لەژێر کۆنترۆڵی مرۆڤدا نەبێت. هەروەها ژیری دەستکرد دەتوانێت هێرشە ئەلیکترۆنییەکان ئاسان بکات بە شیکردنەوەی لاوازییەکان لە سیستەمی زۆر خێرادا.

٥_ زۆر پشتبەستن بە تەکنەلۆجیا: لەگەڵ زیادبوونی بەکارهێنانی ژیری دەستکرددا، ڕەنگە مرۆڤ هەندێک کارامەیی سەرەتایی وەک بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و چارەسەرکردنی کێشەکان لەدەستبدات. پشتبەستنی زۆر بە سیستەمی ئۆتۆماتیکی لەوانەیە ببێتە هۆی شکست و کارەسات ئەگەر ئەم سیستمانە لەکاربکەون.

٦_ پرسە ئەخلاقییەکان: وەک بەکارهێنانی ساختەکاریی قووڵ بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری چەواشەکارانە. لەلایەکی تریشەوە هەرکەسێک دەسەڵاتی پەرەپێدان و بەکارهێنانی AIی هەبێت دەتوانێت سەرچاوە و بازاڕەکان کۆنترۆڵ بکات، ئەمەش دەبێتە هۆی قۆرخکاری لەسەر تەکنەلۆژیا.

**+ چۆن دەتوانرێت ئەم لایەنە نەرێنییانەی ژیری دەستکرد کەمبکرێنەوە؟**

_ لە کۆمەڵێك ڕێگاوە وەك:

• دانانی یاسایەک کە بەکارهێنانی ژیری دەستکرد ڕێکبخات و ڕێگری لە

خراپ بەکارهێنانی بکات.

- دڵنیابوون لەوەی کە سیستەمی AI وردبینی دەکرێت و کراوەن بۆ پشکنین
- ڕاهێنانی تاکەکان لەسەر کارامەیی نوێ کە لەگەڵ گۆڕانی بازاڕی کاردا بگونجێت.
- دانانی چوارچێوەی ئەخلاقی کە ئەخلاقی ژیری دەستکرد وەک بەشێکی سەرەکی لە پەرەپێدان و بەکارهێنانیدا لەخۆبگرێت.

ئەم لایەنە نەرێنیانە پێویستیان بە گفتوگۆیەکی جیهانی بەردەوام هەیە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە AI بەشێوەیەک بەکاردەهێنرێت کە سوود بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت نەک زیان.

**+ کاریگەری ژیری دەستکرد لەسەر بەهاکان چ ئەرێنی و چ نەرێنی چییە؟**

AI تەنها تەکنەلۆژیایەکی بێلایەن نییە؛ کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر بەهاکانی مرۆڤ هەیە، جا چ لە ڕێگەی شێوازی ناوەکیکردنی لە کۆمەڵگەدا بێت، یان لە ڕێگەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە نەخشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەیهێنێت. ئەم کاریگەرییە دەتوانێت ئەرێنی یان نەرێنی بێت و تاڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بە چۆنیەتی پەرەپێدان و بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاوە.

ژیری دەستکرد دەتوانێت بەشداربێت لە کەمکردنەوەی بۆشایی دەستڕاگەیشتن بە خوێندن، چاودێری تەندروستیی و خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان، بەتایبەت لە ناوچە دوورەکاندا.

هەروەها دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە پێشخستنی گشتگیری بۆ خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاکانی وەک خوێنەری دەق، یاریدەدەری دەنگ و وەرگێڕانی هاوکات. سەرباری ئەمەش کۆمەڵێك ئاڵنگاری هەیە کە ڕووبەڕووی بەهاکان دەبنەوە، لەوانەش نەهێشتنی تایبەتمەندی کەسەکان و زیادکردنی لایەنگریی و تێکدانی دادپەروەری بەجۆرێك ئەگەر سیستەمەکانی AI بە وردی چاودێری نەکرێن و پەرەیان پێنەدرێت، ئەوا دەتوانن لایەنگرییە مرۆییەکانی پێشتر هەبوون زیاتر بکەن، زیان بە بەهاکانی دادپەروەریی و یەکسانی بگەیەنن.

لەلایەکی ترەوە جێگرتنەوەی مرۆڤ بە ژیری دەستکرد لە شوێنی کاردا ڕەنگە

ببێتە هۆی هەندێک هەستکردن بە لەدەستدانی کەرامەتی کەسی، چونکە کارکردن لە زۆرێک لە کولتوورەکاندا پەیوەستە بە بەها و ڕۆڵی مرۆڤەوە لە کۆمەڵگەدا. لەگەڵ ئەمەشدا لایەنی تری نەرێنی هەیە وەك کاریگەری لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کەمکردنەوەی کارلێکی مرۆڤ بە جۆرێك لە گەڵ زیادبوونی بەکارهێنانی یاریدەدەری مەجازی و سیستەمی AI، ڕەنگە کارلێکی مرۆڤ کەمتر گرنگ بێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر بەهاکانی پەیوەندی و هاوسۆزی دەبێت.

سیستەمی AI بۆ گەیاندنی ئەزموونی کەسی بۆ هەر بەکارهێنەرێک داڕێژراوە، کە ڕەنگە تاکگەرایی بەرەوپێش ببات لەسەر حیسابی بەها بەکۆمەڵەکانی وەک هاودەنگی و هاوبەشی.

کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆژیا کە سیستەمی AI پەرەپێدەدەن زۆرجار ڕەنگدانەوەی کولتوور و بەهاکانی کۆمەڵگاکانیانن. ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی سەپاندنی «بەهای گشتگیر» کە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی هەر کۆمەڵگایەک لەبەرچاو نەگرن و لایەنگری بەهای جیهانییە لەسەر حیسابی ناوەڕۆکی ناوخۆیی، ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی سڕینەوەی ناسنامەی کولتووریی و زمانی هەندێک کۆمەڵگە.

**+ چارەسەرەکان چین بۆ دڵنیابوون لەوەی کە AI لەگەڵ بەهاکان دەگونجێت؟**

لە کۆمەڵێك ڕێگاوە وەك دانانی ستانداردی ڕوون بۆ پەرەپێدان و بەکارهێنانی ژیری دەستکرد کە لەگەڵ بەها مرۆییەکاندا بگونجێت لەگەڵ دڵنیابوون لەوەی کە ئەلگۆریتمەکانی AI کراوەن بۆ هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوە. لەمانەش پێوستتر بەرەوپێشبردنی هۆشیاریی و فێرکردنی تاك و کۆمەڵگایە کە چۆن کارلێک لەگەڵ ژیری دەستکرد بکات بەشێوەیەک کە ڕێز لە بەها مرۆییەکان بگرێت و پەرەپێدانی سیستەمی ژیری دەستکرد کە تایبەتمەندییەکانی کولتوورە جیاوازەکان لەبەرچاو بگرێت. بەکورتی، AI دەتوانێت هێزێکی بەها بەرزکەرەوە یان هەڕەشەیەک بێت بۆیان، ئەمەش بەندە بەو سیاسەت و ئەخلاق و حوکمڕانییەوە کە هاوڕێی پەرەپێدان و بەکارهێنانین.

**+ ئایا تەکنیکەکانی ژیری دەستکرد لە زمانی کوردیدا بەردەستن و کۆمەڵگەی کورد دەکەنە ئامانج؟**

تەکنۆلۆژیاکانی ژیری دەستکرد کە پاڵپشتی زمانی کوردی دەکەن، هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدایە، بە بەراورد لەگەڵ زمانە جیهانییەکانی وەک ئینگلیزی یان چینی، بەڵام هەوڵەکان بۆ پەرەپێدانی ئەو تەکنۆلۆژیایانە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی کوردزمان و بەئامانجگرتنی کۆمەڵگەی کورد لە زیادبووندایە. لە خوارەوە پێداچوونەوەیەک بە دۆخی ئێستا دەخەینەڕوو:

• پرۆسێسی زمانی سروشتی (NLP): هەندێک پلاتفۆرمی وەک گووگڵ ترانسلەیت پشتگیرییەکی سنووردار بۆ زمانی کوردی دەکەن، بەڵام زۆرجار نادروستە و پێویستی بە باشترکردنی گەورە هەیە.

گەشەسەندنی سیستەمی پرۆسێسکردنی زمانی کوردی هێشتا ڕووبەڕووی ئاستەنگەکانی پەیوەست بە داتا زمانەوانییە بەردەستەکان دەبێتەوە، وەک نەبوونی سەرچاوەی دەقی دیجیتاڵی و هەمەچەشنکردنی شێوەزارەکان (کرمانجی، سۆرانی، زازاکی).

• بەرنامەکانی دەنگی: بەکارهێنانەکانی دەق بۆ قسەکردن (TTS) یان ناسینەوەی قسەکردن (ASR) لە زمانی کوردیدا نەگەیشتوونەتە ئاستێکی پێشکەوتوو، بەڵام هەوڵەکان لەم بوارەدا لەلایەن توێژەران و کۆمپانیا ناوخۆییەکانەوە دەستیان بە دەرکەوتن کردووە.

• لەگەڵ زیادبوونی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە هەرێمی کوردستان و ناوچە کوردستانییەکانی دیکە، ناوەڕۆکی دیجیتاڵی زیاتر دەستپێکردووە کە ڕەنگە پاڵپشتی پەرەپێدانی ژیری دەستکرد بە زمانی کوردی بکات.

• زانکۆ و ناوەندی توێژینەوە هەن کە کاردەکەن بۆ پەرەپێدانی تەکنۆلۆژیای ژیری دەستکرد، کە ئاڕاستەی کۆمەڵگەی کوردی دەکرێت، بەڵام ئەم هەوڵانە پێویستیان بە پاڵپشتی دارایی و تەکنیکی زیاترە. بەشێک لە پرۆگرامەر و توێژەرانی کورد بەشداری دەکەن لە دروستکردنی داتابەیسی زمانەوانی و شیکردنەوەی دەقەکان بۆ پەرەپێدانی تەکنیکەکانی ژیری دەستکرد. سەبارەت بە لەمپەر و ڕێگرییەکانیش چەند خاڵێك دەشێت ئاماژەیان پێ بکرێت وەك:

• ژیری دەستکرد پشت بە داتا گەورەکان دەبەستێت و دابینکردنی سەرچاوەی دەق و دەنگی بە زمانی کوردی تەحەددایەکی گەورەیە.

• فرەچەشنی زمانەوانی: فرەیی شێوەزارە کوردیەکان وادەکات پەرەپێدانی سیستەمی ژیری دەستکرد کە بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵە لەگەڵ زمانی کوردیدا بکات، قورس بێت. ئەگەر حکومەت و کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆجیا پاڵپشتی پەرەپێدانی ژیری دەستکرد بە زمانی کوردی بکەن، بازدانێکی چۆنایەتی لەم بوارەدا بەدی بهێنرێت بەتایبەت لە ڕێگای بەهێزکردنی هاوکاری لەگەڵ زانکۆ نێودەوڵەتییەکان و ناوەندەکانی توێژینەوە کە پەیوەندییان بە زمانە کەمینەکانەوە هەیە. بەشێوەیەکی گشتییش هەنگاوەکانی بەرزکردنەوەی ژیری دەستکرد لە زمانی کوردیدا لە چەند ڕێگایەکەوە دێتەدی وەك:

• دروستکردنی داتابەیسی زمانەوانی و کۆکردنەوەی ناوەڕۆکی دەق و دەنگی بە زمانی کوردی و پۆلێنکردنی وەک سەرچاوەیەک بۆ ڕاهێنانی مۆدێلی ژیری دەستکرد.

• هاندانی توێژینەوەی ناوخۆیی: پاڵپشتیکردنی زانکۆ و پرۆگرامسازەکانی ناوچە کوردستانییەکان بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی تایبەتمەند.

• هاوکاری نێودەوڵەتی: داواکردن لە کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆجیای وەک گووگڵ و مایکرۆسۆفت کە پشتگیری خۆیان بۆ زمانی کوردی فراوانتر بکەن.

• پەرەپێدانی پلاتفۆرمە دیجیتاڵییە کوردییەکان: خستنەگەڕی ئەو ئەپڵیکەیشن و ماڵپەڕانەی کە بەشدارن لە زیادکردنی ناوەڕۆکی کوردی، کە بەشێوەی دیجیتاڵی بەردەستن.

لەکاتێکدا کە تەکنۆلۆژیای ژیری دەستکرد لە زمانی کوردیدا هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدایە، دەرفەتی فراوانکردن و پەرەسەندن هەیە، بەتایبەتی ئەگەر گرنگی بە کۆکردنەوەی زانیاریی و هاندانی توێژینەوە و ڕاکێشانی پشتیوانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بدرێت. ئەم هەوڵانە دەتوانێت ژیری دەستکرد بکاتە ئامرازێکی کاریگەر لە خزمەتکردنی کۆمەڵگای کوردی و پەرەپێدانی ئابووری و کولتوورەکەی

**+ زۆر سوپاس بۆ ئەم چاوپێکەوتنە:**

_ زۆر سوپاس، ئەگەر لە داهاتوودا پێویستت بە هەر یارمەتییەکی زیادە بوو، جا چ لەسەر AI یان هەر بابەتێکی تر، دوودڵ مەبە لە پەیوەندیکردن. بەختێکی باش لە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی چاوپێکەوتنەکە لە گۆڤارەکەتاندا!



**د. بەختیار ئەمین**

**توێژەر و مامۆستای بواری ژیریی دەستکرد**
**لە کۆلێژی زانستی کۆمپیوتەر، زانکۆی سیتی لەندەن**

# کورد لە سەردەمی ژیریی دەستکرددا
# AI

سەرەتا گرنگە بزانین ژیری دەستکرد چیە؟ مێژووی ئەم زانستە دەگەڕێتەوە بۆ کەی، پێش ئەوەی ئاماژە بەڕۆڵی کورد بکەین لە سەردەمی ژیریی دەستکرددا.

بەپێی هەندێک سەرچاوەی زانستی، مێژووی بەکارهێنانی ئامێرەکان بۆ زیاتر لە ٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە. هاوکات، زاراوەی ‹ژیری دەستکرد› بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٠ لەلایەن زانای ئەمریکی جۆن مەکارتی لە میانی کۆنفرانسێکی زانستیدا لە کۆلێژی دارتمۆس ناسێندرا. ئەو زیرەکی دەستکردی بەم شێوەیە پێناسە کردووە: ‹ژیری دەستکرد، زانستی ئەندازیاری دروستکردنی ئامێرە زیرەکەکانە›.

دواتر، زانای بەریتانی ئالان تورینگ لە ڕێگای تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکانی کۆمپیوتەرەوە ئەو پرسیارەی خستەڕوو ‹ئایا ئامێرەکان دەتوانن بیربکەنەوە›؟ ئامانجی ئەو ئەوەبوو کە زیرەکی ئامێرەکان بە بەراورد بە مرۆڤ تاقیبکاتەوە. دەرئەنجام، لەوکاتەوە ئەم تاقیکردنەوەیە بە ‹تاقیکردنەوەی تورینگ - Turing Test› ناودەبرێت و بە داینەمۆی گەشەی خێرای ئەم زانستە و سەرجەم ئامێرەکانی هاوشێوەی ڕۆبۆتە زیرەکان دادەنرێت. لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا، زانستی ژیری دەستکرد بە ڕێژەیەکی بێ ئەندازە لە سەرجەم بوارەکاندا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. هاوکات شارەزایان بە شۆڕشی نوێی ئەلیکترۆنی سەدەی ٢١ The Century of Automation )) ناوی دەبەن. سوودەکانی ژیرەکی دەستکرد زۆرن، لەوانە بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنانی بەکۆمەڵ (Mass Production) لە کارگەکاندا، سیستمی بەڕێوەبردنی دامەزراوە و کۆمپانیاکان، پێشکەوتن لە کەرەستەی سەربازیی و پزیشکی، پەرەپێدانی ئۆتۆمبێلی ئۆتۆنۆم و فڕۆکەی بێفڕۆکەوان، هەروەها مۆدێرنکردنی پرۆسەکانی بەرهەمهێنانی وزە و سووتەمەنی ... هتد.

## زۆرترین فۆکەس لە ساڵی ٢٠٢٤دا لەسەر ژیری دەستکرد بوو:

لە ناوەڕاستی ئەم ساڵدا بەشێک لە توێژەران، پسپۆڕان و بەڕێوبەری کۆمپانیا گەورەکانی تەکنەلۆجیا لە ڕێگای نامەیەکەوە هۆشداری خۆیاندا لە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای ژیری دەستکرد لە هەندێ بواردا و مەترسییەکانی بۆ سەر ژیانی مرۆڤ. تەنانەت، هەندێکیان مەترسی بەکارهێنانی ژیری دەستکردیان بە چەکی ئەتۆمی سەدەی ٢١ بەراورد کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێکی دیکەیان مەترسی خۆیان نیشاندا لە هێزی گۆڕانکارییەکان و ئەگەری وێرانکەری زیاتر لە ڕێگای ئەم تەکنەلۆجیایانەوە، ئەگەر بە سەلامەتی بەکار نەهێندرێن.

لە کۆڕبەندی ئابوری جیهان، سەرۆکی سندوقی درواي نێودەوڵەتی ئاماژەی بە مەترسی دەستبەسەراگرتنی دراوی جیهان کرد لە لایەن کۆمپانیاکانی بواری تەکنەلۆجیاوە. هەروەها ئاماژەی بە نەمان و بەکارهێنانی پارەی کاش لە زۆرێک لە وڵاتان کرد. لە لایەکی ترەوە، زۆربەی شارەزایانی ئابووریی و بازرگانی تەنانەت سیاسەتمەدارانیش نیگەرانی خۆیان دەربڕی لە سەرهەڵدانی شێوازێکی

نوێی ئابووری دیجیتاڵی، پەروەردەی دیجیتاڵی، چارەسەری پزیشکی دیجیتاڵی و ... هتد. هەموو ئەمانە خۆیان دەبیننەوە لە نەمانی ڕۆڵی بانکەکان، مامۆستا و دکتۆر و تەنانەت پارێزەران و بەشێکی زۆری پیشەکانی دیکە.

لە ساڵی ٢٠٢٤دا زۆرترین داهێنانی زانستی و تەکنەلۆجی سەرسوڕهێنەر ڕاگەیەندران، لەوانە: بەرهەم هێنانی تەکنەلۆجیای چات جیبتی (ChatGPT)، تەکنەلۆجیای جەنەرەیتڤ ئەی ئای (GAI)، بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ بۆ کۆنترۆڵکردنی سیستمە دیجیتاڵییەکان یان تەڤاندنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان لە دوورەوە. دواتر تاقیکردنەوەی تاکسییە بێ شۆفێرەکان بۆ یەکەمجار لە شەقامەکانی لەندەن لەلایەن کۆمپانیای تیسلاوە.

هەروەها، داهێنانەکان گەیشتن بەو ڕادەیەی کە بۆ یەکەمجار هەوڵی چاندنی میمۆری زیرەک لە مێشکی مرۆڤدا ئەنجام بدرێت. دواتر، چەمکی بەرهەمهێنانی منداڵ لە ڕێگەی منداڵدانی دەستکرد لە ژینگەیەکی تاقیگەیی کۆنترۆڵکراودا (EctoLife) بوو بە بڕگەیەکی گرنگ، کە دەرفەت بەدایک و باوکەکان دەدات، تاوەکو نەوەکانیان بەپێی تایبەتمەندییەکانی ژیان دیزاین بکەن. واتە، منداڵێک دیزاین بکەن کە هەڵگری نەخۆشییە بۆماوەیەکان یان نەخۆشییە گوازراوەکان نەبێت. جگەلەمانە، هەر لە ڕێگای بەکارهێنانی پرۆگرامی ژیری دەستکردەوە توانرا پشکنین بۆ دی ئین ئەی مرۆڤی سەردەمی نیاندەرتاڵ (زی شاندەر) ئەنجام بدرێت کە لە کوردستان دۆزرایەوە. دەرئەنجام، دەرگای نوێی بۆ تێگەیشتن لە جیناتێکی کۆن و پەرەسەندنی مرۆڤ کردەوە.

هاوکات، گەورە کۆمپانیای (NVIDIA) کە کۆمپانیایەکی پێشەنگی تەکنەلۆژیای میمۆری ئامێرەکانە، توانی لە ڕێگای بەکارهێنانی ژیری دەستکردەوە، کۆمپیوتەری کوانتەم (Quantum Computers) بەرهەم بهێنێت کە توانای ئەنجامدانی هەژماری ژمارە گەورەکانی هەیە بەنموونە، ١ کوادریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) لە چرکەیەکدا، کە بەرانبەرە بە توانای ٣١ ساڵی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی ئەم هاوکێشەیە. بەڕێوبەری کۆمپانیاکە (Jenson Huai) ئەمەی بە بەهێزترین و پێشکەوتووترین داهێنانی سەدەی ٢١ هەژمار کرد.

لە تۆمارێکی ڤیدیۆیدا مارک زوکەربێرگ، خاوەنی گەورەترین کۆمپانیاکانی





مێتا (فەیسبووک، ئینستاگرام، واتسئەپ و ... هتد)، ئاماژە بە بەرهەمهێنان و زۆری ژمارەی ئەیجنتەکان (واتە بەرنامە زیرەکەکان) دەکات. دەڵێت: لە ئایندەیەکی زۆر نزیکدا ژمارەیان لە ژمارەی دانیشتوانی جیهان زیاتر دەبێت. واتە هەموو کەسێک دەتوانێت چەندین ئەجینتی زیرەکی هەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، لەوانە ئەجینتێک بۆ وەرگێڕانی زمانە بیانییەکان، بەرنامەیەکی دیکە بۆ ئامادەکردن و لێنانی ژەمە خۆراکییەکان، یەکێکی دیکە بۆ وەڵامدانەوە و گەیاندنی پەیامەکان ... هتد.

## - ڤیژنی کورد لە سەردەمی ژیریی دەستکرددا: بۆ پلانی ستراتیژیی و یاساییەکان

هەموو پێشبینییەکان بەو ئاڕاستەیەن کە مرۆڤایەتی لە بەردەم وەرچەرخانێکی نوێی گۆڕانکارییە دیجیتاڵی و ئەلیکترۆنییەکاندایە. دەرئەنجام، سەرجەمیان خۆیان دەبیننەوە لە کەمبوونەوەی ڕۆڵی پەرلەمان و حکومەت، کۆتایی بە مامەڵەی بازرگانی و ئابووریی تەقلیدی، پەروەردە و خوێندنی کۆن، کارکردن و دەوامی تەقلیدی، تەنانەت پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئاینییەکان ... هتد. هاوکات گەشەی خێرای ئەم زانستە ئەوەندە جێی سەرنجە توانیویەتی سەرکردەی وڵاتانی وەک فەرەنسا، کەنەدا، بەریتانیا، سعودیە، و ئیمارات ... هتد. ناچار بکا بیر لە دانانی پلانی ستراتیژی خێرا بکەنەوە بۆ پێشخستن و بەرگریکردنی وڵاتەکانیان. تەنانەت کاریگەری لەسەر سەرۆکی تازە هەڵبژێردراوی ئەمریکا (دۆناڵد ترەمپ) هەبوو تاوەکو ئیلۆن ماسک وەک ڕاوێژکاری خۆی دەستنیشان بکات بۆ یارمەتیدانی لە پێشخستنی ئەمریکا لەم بوارانەدا.

دواتر لە وتارێکدا ئیمانوێل ماکرۆن، سەرۆکی فەرەنسا ڕایگەیاند، ئەگەر یەکێتی ئەوروپا وەک چین و ئەمریکا لە بوارەکانی گۆڕانی کەشوهەوا، ژیری دەستکرد- ئای ئای، بەرگریی و ئاسایشدا بە خێرایی هەنگاو نەنێت، ئەگەری هەیە لە دوو بۆ سێ ساڵی داهاتوودا بڕووخێت. دیارە ئامانجی وتارەکەی ماکرۆن ئەوە بوو کە دەبێت بە زووترین کات هەوڵی گەشەکردن و خۆئامادەکردنی خێرا بدەن لەو بوارانەدا.

تاوەکو ئەمڕۆ، زیاتر لە ١٠٠ وڵات چالاکانە لە هەوڵی خۆ ئامادەکردن و داڕشتنی

پلانی ستراتیژن لەگەڵ دەرکردنی یاسای تایبەت بە بەکارهێنان و بەرهەمهێنانی ژیری دەستکرد لە سەرجەم بوارەکاندا. گرنگە بپرسین کە ئایا پلانی عێراق و کورد بۆ ئەم پرسە چییە؟ چونکە هەتا ئەم چرکەساتە هیچ پلانێک یان نەخشە ڕێگایەکی ستراتیژی، تەنانەت یەک ئەلف و بێی یاسایی نووسراو دەربارەی هیچ بابەتێکی تەکنەلۆجی یان ئەلیکترۆنی نە لە عێراق و نە لە کوردستان بوونی نییە.

لە ڕێگەی کەناڵە جیاوازەکانەوە بەڕێوبەرانی تەکنەلۆجیا و شارەزایانی AI بە ئاشکرا هۆشدارییان داوەتە کۆمپانیا و سەرکردەکانی زۆرێک لە وڵاتان، ئاماژەیان بە گرنگی بەکارهێنان یان بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای ژیری دەستکرد لە هەموو بوارەکاندا کردووە، ئەگەرنا مەترسی لەناوچوونیان هەیە یان ڕووبەڕووی دەرئەنجامە چاوەڕواننەکراوەکان دەبنەوە، تەنانەت ئاماژەیان بەوەدا کە لەوانەیە هەندێ وڵات وەکو پێویست پەیوەندییان لەگەڵ جیهانی نوێ نەمێنێت.

**- ڤیژنی کورد لە سەردەمی ژیری دەستکردا: بۆ حکومەتی ئەلیکترۆنی**

ئەمڕۆ بەهۆی پێشکەوتنە خێراییەکانی تەکنەلۆجیاوە، وڵاتان لە هەوڵی کێبڕکێی بەدەستهێنانی ناوبانگی باشترین و پێشکەوتووترین خزمەتگوزاری حکومەتی ئەلیکترۆنیدان. لەوانە وڵاتانی (ئیستۆنیا، دانیمارك، ئوستورالیا، کۆریای باشوور، بەریتانیا، سووید، فینلاند، سەنگافورە، ئیمارات ... هتد)، چونکە، سیستمی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری تەقلیدیی و کۆن هاوشێوەی (سیستمی بەڕێوبردنی کاروباری هاووڵاتیان لە کوردستان) کۆتایی هاتووە. بەداخەوە، بەپێی پێوەرەکانی خزمەتگوزاری ئەلیکترۆنی و ڕیزبەندی نەتەوەیەکگرتووەکان (Online Service Index)، نە عێراق و نە کوردستان دیدێکی ڕوونیان بۆ پەرەپێدان یان بەکارهێنانی ئامێرە زیرەکەکانی ژیری دەستکرد نییە، هەروەها لە ڕیزبەندی نزمترین وڵاتانی جیهاندان لە گەیاندنی خزمەتگوزاری ئەلیکترۆنیدا. لەکاتێکدا، وڵاتی ئیستۆنیا کە لە ساڵی ١٩٩١وە سەربەخۆیی بەدەستهێناوە، لە ماوەی ١٥ ساڵدا سیستەمی حوکمڕانی خۆی گۆڕی. ئێستا لە ٩٩٪ی خزمەتگوزارییە حکومییەکان لە ئیستۆنیا بە ئەلیکترۆنین، لەنێویاندا دەرکردن و نوێکردنەوەی پاسپۆرت. هاوکات، کۆی تێچووی ئەم پرۆسەیە بە ١٠٠ - ١٥٠ هەزار دۆلاری ئەمریکی دەخەمڵێنرێت.

**- ڤیژنی کورد لە سەردەمی ژیری دەستکردا: بۆ پەروەردە و خوێدنی باڵا**

پرۆفیسۆر یۆڤان هەراری، لە کتێبی ٢١ وانە بۆ سەدەی ٢١ ڕەخنە لە سیستەمی پەروەردەی زۆربەی وڵاتان دەگرێت و پێیوایە زۆربەی پرۆگرامەکانی خوێندن بەسەرچووە. بە گوتەی نووسەر و تەنانەت زۆربەی شارەزایانی پەروەردە، لە ١٠ بۆ ٢٠ ساڵی داهاتوودا، نەوەکان ناتوانن سوود لەو بابەتانە وەربگرن کە لە فێرگەکانیان دەخوێندرێن، بە بەراورد لەگەڵ گەشەسەندنی خێرای بایۆئینفورماتیک و زیرەکی دەستکرد. هەربۆیە گرنگە نەوەی داهاتوو فێری چۆنیەتی کارکردن لەگەڵ بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بکرێت، چۆنێتی شیکردنەوەی نەخۆشییە درمەکان لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئامێر و پرۆگرامە زیرەکەکانەوە، یان چۆنیەتی دیزاینکردنی بیناکان بە بەکارهێنانی ئامێرە زیرەکەکان و چەندین داهێنانی تر.

بەبڕوای من، هاوشێوەی وڵاتانی وەک (تایوان، سەنگافورە، ئیستۆنیا، هۆڵەندا، دانیمارک ... هتد) پێویستە بە زووترین کات ڕیفۆرم لە پرۆگرامەکانی پەروەردە و خوێندنی باڵادا لە هەرێمی کوردستان ئەنجام بدرێت، چونکە ڕەنگە پێویست بکات کە خوێندکارێکی بەشی یاسا یان جوگرافیا، دەروونناسی، بازرگانی، ئەندازیاری یان پزیشکی فێری یەکێک لە بابەتە تەکنەلۆجییەکان یان پرۆگرامەکانی زمانی کۆمپیوتەر بکرێت بۆئەوەی لە داهاتوودا سوود لە بڕوانامەکەی وەربگرێت، چ لە ناوخۆ بێت یان دەرەوەی وڵات.

لەکۆتاییدا ماوەتەوە بڵێین، دەکرێت پلانی ستراتیژی کابینەی نوێ حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەبێ کە وەزارەتەکان کەمبکاتەوە بۆ کەمتر لە ١٠ وەزارەت، هاوکات هەوڵبدات ستراتیژیەتی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای نوێ و ژیری دەستکرد بۆ ئەنجامدانی مامەڵەی هاوڵاتیان پەیڕەو بکات.

تێبینی: مەبەست لەم ڕاپۆرتە ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگای کوردی و سسییەکانیەتی لە گۆڕانکارییە خێراکانی سەردەمی تەکنۆلۆجیای ژیری دەستکرد لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانە و زانستییەوە.



پ.ی.د.کامەران محەمەد قادر

# من سێلفیم، کەواتە من هەم

## گۆڕانکارییەکانی خود لە سەردەمی مەجازیدا



(من سێڵفیم، کەواتە من هەم: گۆڕانکارییەکانی خود لە سەردەمی مەجازیدا)ی ئیلیسا گۆدارت، کاریگەرییە قووڵەکانی کەلتووری دیجیتاڵی، بەتایبەتی سۆشیال میدیا و کەلتووری «سێڵفی»، لەسەر پێکهاتن و پەرەسەندنی شوناسی کەسیی ئاشکرا دەکات. لە ڕێگەی تێکەڵکردنێکی بێوێنەی فەلسەفە و دەروونناسییەوە، گۆدارت ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن بوونی سۆشیال میدیا لە هەموو شوێنێکدا تێگەیشتنمانی بەرامبەر بە خود گۆڕیوە، لە ڕەنگدانەوەی بەها کەسییە ناوەکییەکانەوە بۆ بونیادێکی ڕێکخراو و دەرەکی پشتڕاستکراوە، کە بەهۆی کارلێکە دیجیتاڵییە بەردەوامەکانەوە پێکهاتووە.

وەرگێڕی کتێبەکە بۆ زمانی عەرەبی (سەعید پینکراد) دەڵێت: بابەتی کتێبەکە سێڵفییە، کە هەموو شێوەکانی وەهم و لەدەستدان و فریودان و کەمێک ڕاستیی زانست و ژیان لەخۆدەگرێت. سێڵفی ئەرکە خەیاڵکردەکەی لە ناوەڕۆکە تێڕامانی و پێشکەوتوویەکەی خۆی بەتاڵ کردووەتەوە و بە وێنەگەلێک جێگەی گرتووەتەوە کە گوزارشت لە واقیع ناکەن، بەڵکو لەسەر بنەڕەتی فیلتەرگەلێک پێشکەشیان دەکەن، کە (بنەڕەت!)ەکەی باشتر دەکات، یان خراپییەکانی چاک دەکات، یان کەموکوڕییەکانی پەردەپۆش دەکات. ئەمەش بابەتی "لایک" و "کۆمێنتەکان"ە لە ماڵپەڕەکاندا.

ئەو ڕاشکاوتر دەڵێت ئەوەی لە سۆشیال میدیادا ڕوودەدات، ڕووتکردنەوەیەکی تەواوە (Exhibitionism)، ئەمەش یەکێکە لە لادانە سێکسییەکان، لادانێک کە بە ئارەزووی مرۆڤ بۆ دەرخستنی بەشە تایبەتەکانی جەستەیی و وەستان، یان ڕۆیشتن بە ڕووتی لەبەردەم خەڵکیدا بەمەبەستی بەدەستهێنانی چێژی سێکسی جیادەکرێتەوە. جیاوازی چییە لە نێوان کیم کارداشیان، کە ئەستێرەیەکی ساختەیە و تاکە بەهرەکەی بریتییە لە «گۆشتێکی زیادە» کە بە درێژایی کاتژمێرەکان لە فەزای مەجازیدا بڵاویدەکاتەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک کەسی خوێندەوار کە هەموو ڕۆژێکیان بە باسکردنی وردەکارییەکانەوە بەسەر دەبەن؟ کە هەتا دوێنێ دووەمیان بە پەیوەندییەکی گەرم و گوڕ دادەنرا و خەڵکی سوربوون لە سەر پارێزگاریلێکردنی.

## ناونیشان

هەڵبژاردنی ناونیشانی (من سێلفیم کەواتە من هەم) لەلایەن (ئێلسا گۆدار) بۆ کتێبەکە، وەک جێگرەوەیەک بۆ دەستەواژەیەکی بنەڕەتی لە مێژووی فەلسەفەدا، "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" ی ڕێنی دیکارتەوە، ئاماژەیە بۆئەوەی کە (سێڵفیی) گەیشتووەتە قۆناغێکی زۆر گرنگ: دەربڕینی دیدێکی نوێیە، کە ناتوانرێت لە داهاتوودا پشتگوێ بخرێت. هەروەها ئاماژەیە بۆ لەدایکبوونی خودێک، کە دەبێت بەردەوام وەک مەرجێک بۆ شۆڕشێکی نوێ دروست بکرێتەوە

کتێبەکە بەشێوەیەکی گشتی باس لە جیهانی مەجازی دەکات، لەوانەش پرۆسەی وێنەگرتنی سێڵفی، یان وێنەگرتنی جیهانی دەرەوە. دیاردەی "سێڵفی" لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا بۆ زۆر کەس جێگەی تێڕامان و تێگەیشتن و پەیبردن بە واتاکانی بووە.

هەربۆیە وێنەگرتنی سێڵفی بووەتە کردەوەیەکی جەوهەری، کە لە هەموو ساتێکی ژیانی ڕۆژانەدا ئامادەیە، واتە وێنەگرتنی سێڵفی بووەتە هاوڕێیەکی هەمیشەیی بۆ هەر هەنگاوێک کە مرۆڤ لە چالاکییەکانی ڕۆژانەیدا دەینێت، ژمارەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٨دا یەک ملیار و سێ سەد مرۆڤ لەسەر زەوی، سووربوون لەسەر گرتنی وێنەی هەموو ئەو چالاکییانەی کە بەشدارییان تێدا کردووە.

ئیتر (واقیع) پەناگەیەک نییە، کە یادەوەری پەنای بۆ ببات و تێیدا بەدوای حەقیقەتەکانی بووندا بگەڕێت. بەڵکو بووەتە لافیتەیەکی دەرەکی کە چاو لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاویدەکاتەوە. «خواردن»، «پیاسەکردنی کەنار دەریا» و «گەشتکردن» بوونەتە ڕووداوی گەورە. بۆیە کۆمێنتێکی ڕاگوزەریانە لەسەر ڕووداوێکی ڕاگوزەریی بوو بە «ئیمزا»یەکی ڕاستەقینە کە «لایک» و «پێزانینی»ی زیاتری وەرگرت لە تەواوی پاڵەوان و داهێنەرە ڕاستەقینەکانی مێژوو.

## هۆکارەکانی نووسین

پاڵنەرەکانی گۆدارت بۆ نووسینی (من سێڵفیم، کەواتە من هەم) لە نیگەرانییەکانییەوە سەرچاوە دەگرێت، سەبارەت بە کاریگەرییە دەروونی و





کەلتوورییەکانی سۆشیال میدیا لەسەر شوناسی خودیی. گۆدارت بەهۆی پاشخانە دەوڵەمەندە دەروونناسی و فەلسەفییەکەی، بەتەواوی ئاگاداری ئەوەیە کە خۆناسین چ گرنگییەکی گەورەی بۆ تەندروستی دەروونی و خۆشگوزەرانی سۆزداریی هەیە. هەروەها لە میانەی چارەسەرکردنی گۆڕانکارییەکانی پێکهاتنی ناسنامە، هەوڵدەدات بەرامبەر بە مەترسییە شاراوەکانی سۆشیال میدیا بە ئاگامان بێنێتەوە. بۆیە داوا لە خوێنەران دەکات، بیر لە دەرئەنجامەکانی ئەم کەلتوورە دیجیتاڵییە بکەنەوە.

گۆدار لەبارەی کتێبەکەیەوە دەڵێت "ئەوە ڕێگەی منە، وەک فەیلەسوفێک، دەروونناسێک، ژنێک و دایکێک، بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەربەرییەتی جیهانێک کە چیتر تێیدا هەست بە ئاسوودەیی ناکەم، ئەوە پێشنیازی منە بۆئەوەی ئەم جیهانە واتایەکی هەبێت.»

## تایبەتمەندییەکان

یەکێک لە لایەنە هەرە دیارەکانی من سێڵفیم، کەواتە من هەم، بریتییە لە (بەکارهێنانی فرە میتۆدیی). گۆدارت لێکدانەوە فەلسەفییەکان دەربارەی سروشتی خود و شوناس لەگەڵ تێڕوانینە دەروونییەکان سەبارەت بە کاریگەرێتییەکانی سۆشیال میدیا لەسەر تەندروستیی ژیریی تێکەڵ دەکات. لە ڕێگەی ئەم هاوێنەوە، سۆشیال میدیا وەک ئامرازێک دەخاتە ڕوو، کە شوناسی لە دۆخێکی جێگیر و دامەزراو بۆ بارێکی ئەنجامدەر و پەرت گۆڕیوە.

لەم چێوەیەدا گۆدارت چەمکی (کەلتووری سێڵفی) وەک فۆڕمێک لە فۆڕمەکانی پێکهاتنی ناسنامە دەناسێنێت، کە ڕەگ و ڕیشەی لە بەدیهاتنی دەرەکیدا هەیە. لەبری ئەوەی تەنها دەربڕین یان گوزارشتکردنێک بێت لە خود، (سێڵفی) دەبێتە پرۆسەیەک، کە تاکەکان لە ڕێگەیەوە وێنەیەکی خوازراو بۆ وەرگرتنی کاردانەوەکان دروست دەکەن، کە لە شێوەی لایک و کۆمێنت و فۆڵۆوەردا خۆدەنووێنێت. ئەم بازنەی کاردانەوانە، وەک خۆی دەڵێت، شوناسێک دروست دەکات، کە بەردەوام بەدوای پەسەندکردندا دەگەڕێت، واتە پشتبەستنێک بە دووپاتکردنەوە مەجازییەکان دروست دەکات، نەک سەلماندنی خود لە جیهانی

ڕاستەقینەدا.

تایبەتمەندییەکی دووەمی کتێبەکە (ئاسانی دەستڕاگەیشتن)یەتی. هەرچەندە گۆدارت باس لە تیۆرییە ئاڵۆزەکانی شوناس دەکات، بەڵام بەشێوازێکی سەرنجڕاکێش دەنووسێت و زۆر بە خێرایی و ئاسان بە جەماوەرێکی فراوان دەگات. بە تێکەڵکردنی (نموونەکانی جیهانی ڕاستەقینە) و ئەو (زمانەی کە بە ئاسانی واتاکان دەبەخشن) و (شیکارییەکی ورد)، کارەکانی گۆدارت پردێک لە نێوان گوتاری ئەکادیمی و بەرژەوەندی گشتیدا دروست دەکەن، ئەمەش وا دەکات تێڕوانینەکانی بەسەر هەر کەسێک کە ئاشنا بێت بە کاریگەرییەکانی سۆشیال میدیا پراکتیک بکرێت.

## ئەنجام و شوێنەوارەکان

١. خود وەک بابەتی **نمایشکردن:**

گۆدارت گۆڕانکارییەکی گەورە لە (خۆدۆزینەوە) دیاری دەکات: لە خودێکی ناوەکی و شاراوەوە بۆ خودێکی بابەتیی و ئەنجامدەر. ئەو دەڵێت ئەم بابەتگەرییە بووەتە هۆی پرۆسەی پێکهێنانی شوناسێک کە ڕووبەڕووی فشار و بڕیارەکانی کۆمەڵگە دیجیتاڵییەکان بووەتەوە. لەبری خودێکی جێگیر و دامەزراو لەسەر ئەزموون و بەها کەسییەکاندا، خودی دیجیتاڵی ئەمڕۆ پەرت و ئەنجامدەرە، بەردەوام هەوڵی خۆگونجان دەدات و بەدوای بەدەستهێنانی لایک و قبوڵکردن و پەسەندکردنی ئۆنلایندا وێڵە.

بۆ نموونە، گۆدارت ئەوە دەخاتە ڕوو کە چۆن (پێویستی) بەردەوام بۆ پۆستکردن و وەرگرتنی لایک و کارلێککردن لەگەڵ فۆڵۆوەرەکان وایکردووە خودی دیجیتاڵی وابەستەی خۆسەلماندنی دەرەکی بێت، ئەمەش وایکردووە تاکەکان بۆ بەدیهێنانی بەهای خودیی خۆیان پشت بە کۆمەڵگە مەجازییەکان ببەستن. تاکەکان لە میانەی بەرجەستەکردنی خۆیان، بەدەست جۆرێک لە «نامۆبوون»ی خودی ناوەوەیان دەناڵێنن، بەوپێیەی شوناسەکەیان بەشێوەیەکی جیانەکراوە بە کەسایەتی دیجیتاڵی خۆیانەوە دەبەسترێتەوە. ئەنجامی ئەم ئاڕاستەیە دەتوانێت بە قووڵی نیگەرانکەر بێت، دڵەڕاوکێ و خۆبەکەمزانین و خەمۆکی دروست بکات




**٢. سەرهەڵدانی حەزی نەرگسی:**

یەکێک لە گرنگترین ئەو ئەنجامانەی کە گۆدارت پێیگەیشتووە، بریتییە لە پەیوەندی نێوان بەکارهێنانی سۆشیال میدیا و زیادبوونی خەسڵەتە نەرگسییەکان. ئەو تێبینی ئەوەی کردووە کە سروشتی منێتیی (انانیة) سێڵفی کە تاکەکان بە بەردەوامی وێنەی خۆیان بڵاودەکەنەوە، کەلتوورێک دروست و بەهێز دەکات، کە تێیدا بەزۆری جەخت لەسەر دیمەنی دەرەکی و پێگەی کۆمەڵایەتی دەکرێتەوە. ئەم جەختکردنەوە لەسەر ئەو خۆویستییە تۆوی نەرگسییەت ئاو دەدات، چونکە مرۆڤەکان تەرکیز لەسەر ڕێکخستنی «باشترین ئەوەی هەیانە» لەپێناو کەسانی دیکەدا دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا گۆدارت ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە مەرج نییە ئەم نەرگسێتییە هەمیشە تەرکیز لەسەر لەخۆبایبوون یان سەرسامبوون بە خود بکاتەوە. بەڵکو جۆرێکە لە جۆرەکانی پشتبەستن بە جەختکردنەوەکانی ئەوانی تر، کە ڕەفتاری نەرگسی تەنکتر دەکات. ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە تاکەکان زیاتر بەهای خۆیان بە پشتبەستن بەو سەرنجەی کە لە ڕێگەی ئۆنلاینەوە وەریدەگرن پێناسە دەکەن، ئەمەش دەتوانێت هەستکردن بە ناتەواوی بەهێز بکات، ئەگەر پێوەرە بەرزەکانی کەسانی دیجیتاڵی «خۆشەویست» یان «جەماوەریبوون»یان تێدا نەبێت.

**٣. مرۆڤی بەناوبانگ (ئەستێرە):**

لێرەوە سێڵفیی تەنها موڵکی ئەستێرەکانی ئابووریی و سیاسەت و هونەر و میدیا و وەرزش نین. بەڵکو مومارەسەیەکە، لەبەردەستی هەموو هاوڵاتیاندایە. کەسانی ئاسایی لە ڕێگەی وێنەیەکی نائاسایی کە لەلایەن تەکنەلۆژیا دیجیتاڵییە زیرەکەکانەوە بڵاودەکرێتەوە، دەتوانن لە چەند چرکەیەکدا ببنە ئەستێرەی بەناوبانگی جیهانی.

هاوکات سێڵفی بەهای دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بەرز دەکەنەوە، ئەمەش دڵنیایی لە دروستکردنی ساتێکی جەماوەری ڕاستەوخۆ دەدات، کە تێیدا هەموو کەسێک بتوانێت ببێتە دەرهێنەر! دابەشکەری وێنە تایبەتەکانی خۆی، هەروەها ببێتە ئەکتەر لە فیلمەکەیدا، ئەو خواستە دەربڕدراوە ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێت خۆی بکات بە ئەستێرە، واتە دەبێتە پاڵەوانێکی ئایکۆنی. بەمشێوەیە ناوبانگێکی

جیهانی بۆ کەسانێکی سادە بەدەستدێت. لەکۆتاییدا هەمووان لە ئامادەکردنی خۆیان لە تەواوی زۆرێک لە تۆڕە کۆمەڵایەتییە ناوخۆیی و جیهانییەکان بەشێوەیەکی ڕەها و بێ سنوور و چەندایەتی یەکسان دەبن.

**٤. لەدەستدانی ڕەسەنایەتی:**

خاڵێکی دیکە کە گۆدارت ئاماژەی بۆ دەکات، بریتییە لە لەدەستدانی ڕەسەنایەتیی لە کارلێکە دیجیتاڵییەکاندا. ئەو پێیوایە، لەکاتێکدا خەڵک بە وردی ئەو شتانە هەڵدەبژێرن کە لە سۆشیال میدیادا بڵاوی دەکەنەوە، زۆرجار خۆیان لە خستنەڕووی لایەنە خراپ و ئاساییەکان بەدوور دەگرن. ئەم هەڵبژاردنە (انتقائی) لە خۆخستنەڕوودا، دەبێتە هۆی خودێکی دیجیتاڵی نموونەیی بەڵام لە کۆتاییدا ناڕەسەن! کە لەسەر بنەمای چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگە دامەزراوە نەک ڕاستییە تاکەکەسییەکان.

بۆ نموونە زۆرێک لە بەکارهێنەران زۆرجار ژیانی خۆیان وەک ژیانێکی نموونەیی تەواو دەخەنە ڕوو، ململانێ و لاوازی و شکستەکان بەجێدەهێڵن. گۆدارت دەڵێت ئەم خۆپێشکەشکردنە ئینتقائییە وێنەیەکی شێواوی واقیع دروست دەکات، کە نەک تەنها تاکەکان لە خودی ڕەسەنی خۆیان دوور دەخاتەوە، بەڵکو ئەوانی دیکەش هان دەدات، کە بەهەمان ئەندازە بەدوای شوناسێکی نموونەیی نموونەییدا بگەڕێن. ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە، کە ئەم بارە لە لەدەستدانی ڕەسەنایەتیی لە قەیرانی شوناس دروست دەکات، چونکە مرۆڤەکان لە خودی ڕاستەقینەی خۆیان جیا دەکاتەوە، ئەویش لەبەر پاراستنی وێنەیەکی دیجیتاڵی دروستکراو.

**٥. مرۆڤی بوکەڵە:**

گۆدارد پرسیاری ئەوە دەکات، کە چۆن هەڵوێستێک لە سەرەتاوە سادە و هەڕەمەکی بووبێت، دەتوانێت ببێتە ئاماژەیەک بۆ گۆڕانکاری ڕیشەیی لە پەیوەندیمان لەگەڵ خۆمان و ئەوانی دیکە و سەرنجمان بۆ ئەو هەڵسوکەوتانە ڕابکێشێت، کە بەبێ بیرکردنەوە لە زۆربەی بارەکاندا ئەنجامی دەدەین، وەک چۆن بەردەوام بێسوودانە لەگەڵ شاشەی مۆبایلەکاندا سەرقاڵین، تەواو وەک ئەوەی جیهانی مەجازی «بە پێچەوانەی ویستی خۆمان»ەوە ئێمەی بردبێت،

یان وەک ئەوەی بەبێ ویستی خۆمان بوویبێتینە «یارییەک» بە دەست مۆبایلە زیرەکەکەمانەوە.

کتێبەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە تەلەفۆن بووەتە نزیکترین هاوڕێی مرۆڤی مۆدێرن، واتە پێش هەر پەیوەندییەکی مرۆیی دیکە، ئەو بازنەی یەکەمی پەیوەندییەکەی دروستکردووە، بەمەش کشانەوەی لە جیهانی پەیوەندییە مرۆییەکان ئاسانترکردووە، کە دەتوانرێت لە شوێنی کۆبوونەوە گشتییەکاندا مرۆڤەکان وەک جەستە ببینرێن، لەکاتێکدا عەقڵەکان لە جیهانەکانی تردان.

گۆدار پێیوانیە لە سەردەمی سێلفیدا جیهان لە گۆڕاندابێت! بەڵکو ئەوە ڕێگەی پەیپێبردن و تێڕوانینی ئیمەیە بۆ جیهان گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمەش لە ڕێگەی دەرکەوتنی ناوەندێکەوە لە نێوان ئێمە و ئەودا بەدیهات، ئەویش ئەو ئامرازە تێکەڵ و جۆراوجۆرانەیە، کە هەمیشە ئامادەیە، کە لەیەک کاتدا مۆبایل و شاشە و ئامێری فۆتۆگرافی و کۆمپیوتەرە کە ئێمە بە «زیرەک» وەسفی دەکەین و ناوی لێ دەنێین "مۆبایلی زیرەک".

لەکۆتاییدا نووسەر لە کتێبەکەیدا زەنگی ئاگادارکردنەوە لێدەدات و دەڵێت: پێویستە لە «دیاردەی سێڵفی» تێبگەین و بیخەینە چوارچێوەی بیرکردنەوەیەکی گشتگیر سەبارەت بەوەی چی لە فەزای مەجازیدا پلانی بۆ دادەنرێت و هەرگیز لە گەشەکردن نەوەستاوە. سێڵفی، لە ڕێگەی دەرکەوتنە جۆراوجۆر و بێ بایەخەکانییەوە، بووەتە سیمبۆلی کۆمەڵگایەک کە لە لوتکەی گۆڕانکارییەکانیدایە، کۆمەڵگایەک کە گەنجان بەهۆی شارەزابوونیان لە تەکنەلۆژیای نوێ بەڕێوەی دەبەن.

بەمشێوەیە کتێبەکە وەڵامێکە بۆ کۆمەڵگەیەک، کە تادێت بەهای دووپاتکردنەوەی دەرەکی بەسەر گەشەکردنی ناوەکی و خۆناسیندا دەدات. گۆدارت ئامانجی ئەوەیە تیشک بخاتە سەر ئەوەی کە چۆن ئەم گۆڕانکارییە وایکردووە، بەلای تاکەکانەوە قورس بێت پارێزگاریی لە هەستێکی ڕیشەدار بەخود بکەن، لە جیهانێکدا کە بەردەوام هانی خۆنمایشکردن و بەراوردکردن دەدات.

# پێشەکی

لەوەتەی دەستم بە گەنجینەی دەستنووس و بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی گەورەی عوسمانی کەوتووە و سەرقاڵی گەڕان و سۆراغی مێژووی کورد و کوردستان و زانا و کەسایەتییە جۆراوجۆرەکانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستانم، ڕێم لە زۆر بەڵگەی نەبینرا و نەبیستراو لەسەر مێژووی کورد و ژیان و بەرهەمی زانا و ناودارانی نەناسراو و گومناوی کورد کەوتووە، کە لە زۆر بواری کارگێڕی، سەربازی، دادوەری، مێژووی، سیاسیی و ئەدەبی و زمانەوانی دەوڵەتی عوسمانیدا ڕۆڵی گەورە و گرانیان گێڕاوە، ئەگەرچی لە بەشێکی تێزی دکتۆراکەمدا لام بەلای چەند کەسایەتییەکی گەورەی سلێمانی لەوانە(مستەفا زیهنی و کوڕەکانی، ئەحمەد فائیز، ڕەسوڵ مەستی، ئەمین فەیزی، عەبدولڕەحمان ناجم، مەلاونازادە ڕەفعەت ...تاد) کردووەتەوە، کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕۆڵی گەورە و پێشەنگیان هەبووە، بەڵام وادیارە تا دێت ژمارەی کەسایەتییەکان زۆرتر و زۆرتر دەبن و پێویستیان بە توێژینەوە و لەسەر وەستانی زیاترە! هەر لەوچوارچیوەشدا لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا لەسەر چەند کەسایەتییەکی دیکەی کوردی خەڵکی هەولێر و ناوچەکانی دیکەشم نووسیوە، هەم لە سۆراغ و هەمیش لەسەر نووسین بەردەوامم تاوەکوو بزانین لەکۆتاییدا ئەم پرۆژە بەکوێ دەگات؟

لێرەدا لەچوارچێوەی ئەو پرۆژەدا، ئەم نووسینەم تەرخانکرد بۆ نووسین لەسەر کەسایەتییەکی هەڵکەوتووی کوردی بەڕەچەڵەک خەڵکی سلێمانی، کە خاوەن ناوێکی درەوشاوە و پایەیەکی ئەدەبیی بەرز و ڕۆشنبیرێکی گەورەیە لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری کۆتا سەردەمی عوسمانیدا، کە سایەتییەک کە بە نوێنەرایەتی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٩٢ لەلایەن خودی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە هەڵبژێردراوە و نێردراوە تاوەکو بەشداری لە کۆنفرانسی ڕۆژهەڵاتناسی لە شاری لیشبوونەی پرتوگال بکات. کەسایەتییەک کە لەیەککاتدا ڕۆژنامەنووسێکی بەرچاو و ئەدیب و زمانزانێکی گەورە بووە، ڕۆژنامەنووسێکی وەها گەورە بووە کە توانیوویەتی بگاتە پۆستی سەرنووسەری





هەریەکە لە ڕۆژنامە هەرە بەناوبانگەکانی ئەستەنبوڵ وەکو: (جریدەی عسکریە، حوادس، حقیقت) کە سێیان لە هەرە بەناودەنگترین ڕۆژنامەکانی سەدەی نۆزدەیەم بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا. ئەدیب و زمانزانێکی ئەوەندە گەورەش بووە، لەلایەک شانشانێنی ئەدەبیی و مشتومڕی زمانەوانی لەگەڵ گەورە شاعیر و ئەدیبی عوسمانی (شیناسی)دا کردووە، لەلایەکی دیکە ڕەخنەی لە پەرتووکی (بلاغت عثمانیە) گەورە زانای عوسمانی ئەحمەد جەودەت پاشا گرتووە. دواتر هەر لە بواری بەلاغەت و ڕیتۆریکدا چەندین پەرتووکی ڕەسەن و پەسەنی نووسیوە، کە لەم توێژینەوەماندا باسمان کردووە. سەرباری هەموو ئەوانەش بەنووسینی پەرتووکی(اخوت عسکریە) بووەتە پێشەنگی کایەی نووسین لە بواری پەروەردەی مەعنەوی سەربازی لە ئەدەبیاتی عوسمانیدا. کەسایەتییەک بەم هەموو تایبەتمەندییە دەگمەنانەی کە هەیبووە، نەک بە زمانی کوردی کە هیچی لەبارەوە نەنووسراوە، بەڵکو لە لیتراتۆری عوسمانیشدا بە ئەندازەی پێویست لای بەلادا نەکراوەتەوە و توێژینەوەی پێویستی لەبارەوە نەکراوە، هەربۆیە لێرەدا هەوڵدەدین لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان و پەرتووکەکانی خۆی تیشک بخەینە سەر ژیان و بەرهەم و ڕۆڵی ئەم کەسایەتییە گەورەی کورد لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

هەڵدانەوەی بۆ یەکەمینجار تۆماری ژیاننامەکەی لە تۆماری گشتی دەوڵەتی عوسمانی، ناساندنی هەر شەش پەرتووکەکەی و بڵاوکردنەوەی بەرگی پێنج لە پەرتووکەکانی لەگەڵ وێنەیەکی کەسیی خۆی کە یەکەمینجارە بڵاویدەکەمەوە تەوەرەکانی بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوە پێکدەهێنن. ئەمەش بەئامانجی ئەوەی ئەم کەسایەتییە گرنگە لە سێبەری مێژوو بهێنرێتە دەرەوە و تۆزی سەر لاپەڕەکانی ژیانی بتەکێنرێت و بەخوێنەری کوردی ئاشنا بکەین.

لە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەدا هەوڵدەدەین، ڕاپۆرتی گەشتەکەی عەبدولڕەحمان بۆ شاری لیشبوونە و ئەو شوێنانەی سەردانی کردوون کە وەختی خۆی پێشکەشی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی کردووە، پێشکەش بە خوێنەرانی کورد و (گۆڤاری خاڵ) بکەین.

### ١. ژیانی عەبدولڕەحمان سورەیا(مەردۆخیزادە)

بەگوێرەی تۆماری ژیاننامەی ناوبراو لە تۆماری گشتی دەوڵەتی عوسمانیدا، عەبدولڕەحمان سورەیا کوڕی شێخ ئەبوحامد محەمەدە، لە ساڵی (١٢٥٧کۆچی/ ١٢٥٧ ڕومی) کە بەرانبەرە بە (١٨٤١ یان ١٨٤٢زایینی) لە شاری بەغدا لەدایکبووە.[١] یەکێک بووە لە ئەدیبە پایەبەرزەکان و لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانی سلێمانی بووە. سەرەتای خوێندنی لە بەغدا دەستپێکردووە و دواتر چووەتە ئەستەنبوڵ و لەوێ بەردەوامی بەخوێندنەکەی داوە، دوای تەواوکردنی خوێندن لەوێ نیشتەجێبووە و ماوەتەوە و هەر لەوێش کۆچی دوای کردووە.[٢]

عەبدولڕەحمان سورەیا، زمانزانێکی گەورە و شارەزا بووە، لەبارەی ئەو زامانانەی ناوبراو زانیوونی لە بەڵگەی تۆماری ژیاننامەکەی لە تۆماری گشتی دەوڵەتی عوسمانیدا هاتووە:» توانیوویەتی بە عەرەبی، فارسی، تورکی بنووسێت و زمانی کوردی و فەرەنسیشی زانیووە.»[٣] نووسەرێک لەبارەی زمانزانییەکەیەوە، ئاماژەی بەوەکردووە کە ناوبراو جگە لە زمانی فەرەنسی، زمانەکانی عەرەبی و فارسییەکی ئەوەندە باشی زانیووە کە بتوانێت شەرح و شرۆڤەی مەتنە کلاسیکییەکانی ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی پێ بکات.[٤] هەروەک چۆن سێ زمانی تورکی، عەرەبی و فاسی زانیوە، ئەوهاش زمانەکانی: کوردی و فەرەنسیشی زانیوە و لە ڕۆژنامەکاندا ژمارەیەکی زۆر وتاری لەبارەی:

---

1BOA. DH. SAIDd. 76. 91. H.29-12-1257.

شایەنی باسە لە لیتراتۆری تورکیدا ساڵی ١٨٤١ بە ساڵی لە دایکبوونی دانراوە.

2 Bursalı Mehmed Tahir Bey, Osmanlı Müelifleri , 2.cilt, Hazırlayanlar: A. Fikri Yavuz ve İsmail Özen, Meral yayınevi, İstanbul 1972, s. 45.

شایەنی باسە بورسەلی محەمەد تاهیر لەم پەرتووکەیەدا لە باسی عەبدولڕەحمان سورەیا نازناوی (سولەیمانیەلی) لە پێش ناوەکەی داناوە.

3 BOA. DH. SAIDd. 76. 91. H.29-12-1257.

4 Kazım YetiŞ, Abdurrahman Süreyyâ, Mîrdûhîzâd (1841-1904)Belâgatla İlgili Kitap Ve Makaleleriyle Tanınan Gazeteci-Yazar:https://islamansiklopedisi.org.tr/abdurrahman-sureyya-mirduhizade eriŞim tarihi 28.12.2024.

ڕەوانبێژی، زمان و ئەدەبیاتەوە نووسیوە.[1] عەبدولڕەحمان سورەیا، دەستێکی باڵای هەبووە لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی ئەو هۆنراوانەی لە سەردەمە جیاوازەکاندا بە زمانی عەرەبی و فارسی نووسرابوون.

ناوبراو لەپاڵ گرنگی و بایەخدانی بە نووسین و زمان و ئەدەبیات لە چەند پۆستێکی کارگێڕیی شارەکانی (ئەدەنە و کۆنییە)دا کاریکردووە. لە دیارترین ئەو پۆستانەش: دامەزراندنی بووە بە مووچەی (٥٠٠) پێنج سەد قرووش بە وەکالەتی مودیرییەتی قەزای (صاری قواق- Sarıkavak) لە سەنجەقی (ئیچ ئیل) لە ئەیالەتی کۆنییە لە ١٧ی حوزەیرانی ١٨٦٣زایینی.[2]

دوای ماوەیەک لە بەجێگەیاندنی چەند فەرمانبەرێتییەک بەسەرکەوتوویی لە ویلایەتەکان، دواتر ڕوویکردووەتە بواری پەروەردە و وانەگوتنەوە، بەجۆرێک لە ساڵی ١٨٦٧ لە ڕووشدییەی بەیلەربەیدا، لە ساڵی ١٨٧٠ لە دارالمعلمین مامۆستای زمانی فارسی بووە.[3] دواتریش لە چەند جێگەیەکی دیکە وانەی جۆراوجۆری وتووەتەوە.

پاشان ڕوویکردووەتە بواری ڕۆژنامەگەریی و لەو بوارەشدا توانیوویەتی ئەسپی خۆی تاوبدات و بەرەوپێشچوونی زۆر بەخۆیەوە ببینێوە، تاوەکوو لە ساڵی(١٢٨٨ک/ ١٨٧١ز) کراوە بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی

---

1 Kazım Yetiş, a. g. m.

2 BOA. ŞD. 465. 50. 01.

3 Kazım Yetiş, a. g. m.

عەسکەرییە[1](Ceride-i Askeriyye).[2] ساڵی ١٨٧٢ لە ڕۆژنامەی «حوادس[3]» و ساڵی ١٨٧٦ لە ڕۆژنامەی «حەقیقەت» پۆستی سەرنوسەری هەبووە. هاوکات ساڵی ١٨٧٦ لە قوتابخانەی مەهرەجی ئەقلام[4](Mahrec-i Aklam) بابەتی زمانی عەرەبی و لە ١٨٨٤ لە مەکتەبی حقوق وانەی ئەدەبیاتی عوسمانییە و تەعلیمی ئەدەبیاتی وتووەتەوە[5] هەروەها لە(دارالفنون) و (دارالمعلیمین)یش کاری مامۆستایەتی کردووە.[6]

---

١ جریده عسکریه: یەکەمین ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە لە ١٦ی کانونی دووەمی ١٨٦٤ز لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزدا بڵاوکراوەتەوە، ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بووە هەفتەی جارێک لە دووتوێی چوار لاپەڕەدا ڕۆژی شەممان لە چاپخانەی مەکتەبی حەربییە (Mekteb-i Harbiye Matbaası) چاپکراوە. نووسین و هەواڵی جۆراوجۆری لەبارەی هێزی وشکانی و کەشتیگەلی عوسمانی تێدا بڵاوکراوەتەوە. جەریدەی عەسکەرییە لە ١٦ی کانونی دووەمی ١٨٦٤ تاوەکو ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ سەرباری هەندێ پچران ماوەی ٥٨ ساڵ لە چاپ و بڵاوبوونەوە بەردەوام بووە. بۆ زیاتر بڕوانە:

Ali Emre Yerdoǧan, Cerîde-i Askeriyye Gazetesġ'nin Tasnîfi (1864-1870), Aydın Adnan Menderes Üniversitesi Sosyal Bilimler Enstitüsü Tarih Anabilim Dalı 2019.

2 Bursalı Mehmed Tahir Bey, a. g. e, s.45.

٣ جریده حوادث: یەکەمین ڕۆژنامەی تایبەت بووە کە لە سنووری قەڵەمڕەوی عوسمانیدا چاپ و بڵاوکرابێتەوە، یەکەم ژمارەی لە (١ی جەمادیلئاخەری ١٢٥٦کۆچی/ ٣١ی تەمووزی ١٨٤٠زایینی) بڵاوکراوەتەوە، لە سەرەتادا (١٠) ڕۆژ جارێک بڵاوکراوەتەوە، دواتر و لە ژمارە(١٣٩)یەوە لە ساڵی ١٨٤٩ز بووە بە هەفتانە، بەکۆی گشتی (١٢١٢) ژمارەی لێ دەرچوێنراوە. خاوەنی ئەم ڕۆژنامە کەسایەتییەکی ئینگلیز بووە بەناوی ولییەم چەرچیڵ ( William Churchill) لە (١٨٣١-١٨٣٣ز) کاری نووسیاری کردووە لە سەفارەتی گەورەی ئەمریکا لە ئەستەنبوڵ و دواتر سەرقاڵی کاری بازرگانی بووە. بۆ یەکەمجار وشەی (جریده) لە چاپەمەنی عوسمانیدا لە پێشەکی ژمارە(١) ی ڕۆژنامەی (حوادث)دا بەکارهاتووە، کە بە مانای زیادکردنی زانیاری خەڵکی، گواستنەوەی ڕووداو و پێشهاتی وڵاتانی دیکە و یارمەتیدان لە پێشخستنی کایەی بازرگانی و ژیانی خەڵکدا بەکاربراوە. بۆ زیاتر بڕوانە:

Ziyad Ebüzziya, Cerîde-I Havâdis, https://islamansiklopedisi.org.tr/ceride-i-havadis eriŞim tarihi: 30.12.2024.

٤

5 Kazım YetiŞ, a. g. m.

6 Bursalı Mehmed Tahir Bey, a. g. e, s. 46.

له ساڵی ١٨٩٢ به نوێنەرایەتی دەوڵەتی عوسمانی، نێردراوە بۆ پرتوگال بۆ بەشداری لە کۆنفرانسی ڕۆژهەڵاتناسی لە شاری لیشبوونە، کە دواتر و لە بەشی دووەمدا بە تەوەرێکی سەربەخۆ لەسەر ئەم کۆنفرانسە و دانانی ناوبراو وەک نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی و گەشتەکەی بۆ لیشبوونە و پورتوگال، ئەو شوێنانەی لەوێ سەردانیکردوون دەوەستین.

**١.١. خانەنشینبوونی عەبدولڕەحمان سورەیا (١٩٠٢ز).**

بەگوێرەی زانیارییەکانی ناو نووسراوێکی فەرمی (مقام سر عسکر) کە بەرزترین دامەزراوەی سەربازی عوسمانی بووە، عەبدولڕەحمان سورەیا دوای(٤١) ساڵ خزمەتکردن و بەهۆی پیریی و هاریکارنەبوونی باردۆخی تەندروستی و توانای جەستەیی داوای کردووە خانەنیشین بکرێت، لە نووسراوەکەیاندا ئاماژەیان بە یەکەمین فەرمانی دامەزراندنی لە ١٧ی حوزەیرانی ١٨٦٣ز کردووە کە بە مووچەی (٥٠٠) پێنج سەت قرووش بە وەکالەتی مودیرییەتی قەزای (صاری قواق- Sarıkavak) لە سەنجەقی (ئیچ ئیل) لە ئەیالەتی کۆنییە و دواتر ئەدەنە دامەزراوە. دواتر باسی یەک بەیەکی پۆستە کارگێڕییەکان و مووچەکانی کراوە، باسیشی لەوە کردووە کە لە پای خزمەتەکانی لە ١٤ حوزەیرانی ١٩٠١ بەرزکردنەوەی مووچەکەی گەیشتووەتە(٣٥٠٠) قرووش. دواتر دوای لێکدانەوەی ساڵی خزمەت و مووچەکان و بەگوێرەی بڕگە جۆراوجۆرەکانی یاسا کارپێکراوەکان ڕایانگەیاندووە ناوبراو شایانی ئەوەیە بە مووچەی مانگانەی(١٩٧٦،٥) هەزار و نۆسەد و حەفتاوشەش قرووش و نیوێک خانەنیشین بکرێت. هەر لەو نووسراوەی مەقامی سەرعەسکەردا هاتووە کە مامەڵەی خانەنشین بوونی ناوبراو نێردراوە بۆ سندوقی خانەنشینی گشتی سەربازی لە وەزارەت و ئەوانیش وردبینیان کردووە و ئەو مووچەی دیاریکراوە ڕەزامەندییان لەسەر داوە، لە نووسراوی مەجلیسی ژمێریاری سندوقی ناوبراوەوە نووسراو هاتووە ناوبراو بە مووچەی هەزار و نۆسەت و حەفتاوشەش قرووش و نیوێک خانەنیشین بکرێت و مووچەکەی لە سندوقی پەیوەندیدار بدرێت.[1]

دیارە ئەم نووسراوەی مەقامی سەرعەسکەر مەزبەتەیەک بووە کە لەلایەن

1 BOA. ŞD. 465. 50. 01.

کۆمیسیۆنی سەربازییەوە ئامادەکراوە بە مۆر و واژۆی هەموو ئەندامەکانی کۆمیسیۆنی سەربازییەوە بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری پێویست و ناردنی بۆ بابی عالی، سەرەتا بۆ مەجلسی شورا نێردراوە. لە بەرواری ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٢ز. دواتر هاوپێچ لەگەڵ ئەم ڕاپۆرتە ورد و پڕزانیارییە، بە نووسراوی ژمارە (١٩٩) لە ڕێکەوتی ٦ تشرینی یەکەمی ١٩٠٢ و بە واژۆی خودی سەرعەسکەر بە ئاماژەکردن بۆ مەزبەتەی کۆمیسیۆنی سەربازیی و ئاماژەکردن بۆ پوختەیەکی زانیارییەکانی ناو مەزبەتەی ناوبراو داوای کردووە ڕەزامەندی لەسەر بڕیاری خانەنیشینکردنی عەبدولڕەحمان سورەیا بدرێت.[1]

بەوشێوە لەسەر داوای خودی خۆی و پاڵپشت بە نووسراوی مەقامی سەرعەسکەر، بەگوێرەی نووسراوێک کە لە (٢٣ ڕەجەبی ١٣٢٠ک/ ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٢ز) لە سەدارەتی عوزماوە بۆ مەقامی سەرعەسکەر نێردراوە تێیدا هاتووە: پاڵپشت بە نووسراوی (١٩٩) مەقامی سەرعەسکەر و مەزبەتەی ناوبراو بڕیاری خانەنیشینکردن عەبدولڕەحمان سورەیای سەرنوسەری(جریدە عسکریە) بە مووچەی مانگانەی هەزار و نۆسەد و حەفتاوشەش قرووش و نیوێک لەلایەن مەجلسی شوراوە ڕەزامەندی لەسەر دراوە.[2] بەو جۆرە عەبدولڕەحمان سورەیا دوای چل و یەک ساڵ خزمەت لە کایە جیاوازەکاندا لەسەر داوای خۆی خانەنیشن دەکرێت.

### ٢.١. نەخۆشکەوتنی عەبدولڕەحمان سورەیا (١٩٠٢)

وادەردەکەوێت، عەبدولڕەحمان سورەیا لە سەرەتای ساڵی ١٩٠٢وە دووچاری نەخۆشی بووبێت، دوای گەیشتنی هەواڵی نەخۆشکەوتنی سەرنوسەری خانەنیشینکراوی (جریدە عسکریە) بە سەرۆکایەتی حکومەت، بەگوێرەی نووسراوێکی سەدارەت (سەرۆکایەتی حکومەت) کە لە بەرواری ١٦ محرم ١٣٢٠ک/ ٢٥ نیسانی ١٩٠٢ز بۆ بەرپرسی سندووقی خانەنشینی سەربازی ناردووە، تێیدا ئاماژەی بەوەکردووە کە هەواڵمان پێگەیشتووە سەرنووسەری خانەنشینبووی(جریدە عسکریە) ماوەیەکی درێژە، زۆر نەخۆشە و زۆر پێویستی

1 BOA. ŞD. 465. 50. 02.

2 BOA. BEO. 1941. 145531.01.

بە پارەیە، هەربۆیە بڕی پێویست لە مووچەی کەڵەکەبووی بۆ دابینکردنی چارەسەر پێ بدرێت.[1]

سەرباری خانەنشین بوونی و دووچاربوونی بە نەخۆشی، پێ دەچێت هەر بەردەوامبووبێت لە وتنەوەی وانەی (ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی) لە مەکتەبی مولکییە و دار الفنونی شاهانە! ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی، لە نووسراوێکی بەڕێوەبەری(مکتب مولکیە و دار الفنون شاهانە) کە ناوی (رەجائی) بووە، کە لە بەرواری(٢٨ی شەوال ١٣٢١ک/ ١٧ی کانونی دووەمی ١٩٠٤ز) بۆ وەزارەتی مەعاریفی ناردووە، تێیدا ئاماژەی بەوەکردووە، عەبدولڕەحمان سورەیا کە لە بەشی ئەدەبیاتی دارالفنونی شاهانە کە بە کۆی گشتی هەزار و دوو سەد قرووش، هەفتانە دوو سەعات ئەدەبیاتی عەرەبی و دوو سەعات ئەدەبیاتی فارسی دەڵێتەوە، بەهۆی ئەوەی ماوەیەکە تووشی نەخۆشی بووە، ئیدی ناتوانێت بەردەوامی بە وتنەوەی وانەکان بدات، هەتا ئەوکاتەی چارەسەردەبێت و بۆئەوەی قوتابییەکان بێ مامۆستا نەبن و وانەکانیان بخوێنن داواکارین لە بەڕێزتان کەسێک بە نیوەی مووچەکەی لە جێگەی دیاری بکەن.[2] لەسەر بنەمای ئەم داواکارییە، وەزارەتی مەعاریف بڕیار دەدەن کە بە وەکالەت وانەی فارسی بدرێتە حەمدی بەگ ئەندامی مەجلیسی مەعاریف و وانە عەرەبییەکەشی بدرێت بە نووری ئەفەندی ئەندامی دەستەی (تفتیش و معاینە) لە وەزارەتی مەعاریف هەتا ئەوکاتەی ناوبراو تەندروستی باش دەبێتەوە.[3]

لە زانیارییەکانی ناو ئەو دوو بەڵگەنامەوە دەتوانین ئەوە هەڵبهێنجین، کە ناوبراو سەرەڕای ئەوەی لە ١٩٠٢ لە کاری سەرنووسەری ڕۆژنامەی سەربازی خانەنیشینکراوە و لە هەمان ساڵدا نەخۆش کەوتووە، بەڵام هەفتانە چوار سەعات (دوو سەعات ئەدەبیاتی فارسی و دوو سەعات ئەدەبیاتی عەرەبی) لە بەشی ئەدەبیاتی مەکتەبی مولکییە و دار الفنوونی شاهانە وتووەتەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٠٤ ئیدی نەخۆشی بڕستی لێ بڕیوە و توانای وانەوتنەوەی نەهێشتووەتەوە،

---

1 BOA. BEO. 2305. 172830.01.

2 BOA. MF.MKT. 673.67. 01.

3 BOA. MF.MKT. 673.67. 02.

لەبەرئەوە بەڕێوەبەری ئەو جێگە داوایکردووە کەسی دیکە لە جێگەی دابنێن و شوێنەکەی بەوەکالەت پڕکراوەتەوە، هەتا ئەوکاتەی تەندرووستی باش دەبێت، دیارە نەخۆشییەکەی ناوبراو چارەسەر نەبووە.

### ٣.١. کۆچی دوای عەبدولڕەحمان سورەیا (٣٠ تەمووزی ١٩٠٤)

ئەگەرچی نووسەری پەتووکی(OSMANLI MÜELLİFLERİ) بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ڕۆژ و مانگی کۆچی دوای عەبدولڕەحمان سورەیا بکات، ئاماژەی بەوە کردووە کە ناوبراو لە ساڵی ١٩٠٤ کۆچی دوایی کردووە و لە ئەستەنبوڵ نێژراوە.[1] بەڵام ئێمە دوای گەڕانمان توانیمان بەڵگەنامەیەکی تایبەت بە عەبدولڕەحمان سورەیا لە ئەرشیفی عوسمانی دەستبخەین کە بەرواری کۆچی دوایی ناوبراوی بە ڕۆژ و مانگ و ساڵ تێدایە. ئەو بەڵگەنامەیەش بریتییە لە دۆسیەیەک لەلایەن مەقامی سەرعەسکەرەوە بۆ شورای دەوڵەت نێردراوە، دیارە دوای کۆچی دوایی عەبدولڕەحمان سورەیا خێزانەکەی کە ناوی(فاتمە زەهرا) بووە، داوای کردووە مووچەی خانەنشینی هاوسەرەکەی بخرێتەسەر ئەو، بەگوێرەی  زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکە، کە نووسراوی فەرمی دائیرەی مەقامی سەر عەسکەرەوە بە مۆری ئەندامانی کۆمیسیۆنی سەرعەسکەر لە بەرواری ١٢ی شەعبان ١٣٢٢ک/ ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٤ز نێردراوە، تێیدا هاتووە، بەرمەبنای مردنی سەرنوسەری خانەنشینکراوی (جريده عسكريه)، خێزانەکەی بەناوی (فاتمە زهرا) داوای کردووە مووچەکەی بۆ خودی خۆی تەرخان بکرێت و عەرز و حاڵی پێشکەشکردووە، دوای لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوتووە کە عەبدولڕەحمان سورەیا لە ڕیکەوتی(١٧تەمووز ١٣٢٠ ڕومی/ ٣٠ تەموزی ١٩٠٤ز) کۆچی دوایی کردووە. لەبەرئەوەی خێزانەکەی فاتمە زەهرا کەسی دیکەی نەبووە، لەو مووچەی خانەنشینییەی کە هەزار و نۆسەد  وحەفتاو شەش قرووش و نیوە، بەگوێرەی مادەی (١٦) نیزامنامەی تایبەت مانگانە بڕی(٧٤٤) قرووشی بەردەکەوێت و پێویستە بیدرێتێ.[2] دیارە بەگوێرەی ڕێسای بیرۆکراتییەتی عوسمانی سەرعەسکەر بە واژۆی خۆی پوختەی ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتەی کۆمیسۆنی سەربازی

1 Bursalı Mehmed Tahir Bey, a. g. e,  s.46; Kazım Yetiş,  a. g. m.

2 BOA. ŞD. 647.46.01.

دائیرەکەی خۆی بەنووسراوی ژمارە(٢٣٩) لە بەرواری (١٨ی شەعبان ١٣٢٢ک/ ٢٨ تشرینی یەکەمی ١٩٠٤ز) ناردووە بۆ سەدارەت بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر بدەن.[١] لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەڵگەنامە بەرواری ڕۆژ و مانگ و ساڵی کۆچی دوایی عەبدولڕەحمان سورەیامان بۆ ڕوونبوویەوە و ئەوەشمان بۆ دەرکەوت، کە خێزانی ناوبراو ناوی (فاتمە) بووە.

هەرچی لەبارەی شوێنی ناشتنی عەبدولڕەحمان سورەیایە، نووسەرێک ئاماژەی بەوەکردووە، ناوبراو لە ئەستەنبوڵ کۆچی دوای کردووە و هەر لە ئەستەنبوڵ نێژراوە و گۆڕەکەی لە دەوروبەری مزگەوتی ئەیوب سوڵتانە (لە بەشی ئەورووپی شاری ئەستەنبوڵ).[٢]

**٢. دانراوەکانی عەبدولڕەحمان سورەیا (مەردۆخیزادە)**

عەبدولڕەحمان سورەیا، سەرەتا بە ڕەخنەی ڕۆژنامەوانی سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشاوە، دواتر بە نووسین و دانانی پەرتووک لە بواری ڕەوانبێژیدا ناسرا. یەکەمین دانراوی لە بواری بەلاغەت دا بریتی بووە لەو نووسینە ڕەخنەییەی کە لەسەر بەرگی یەکەمی پەرتووکی« بەلاغەی عوسمانییەی»ی ئەحمەد جەودەت بەناوی« تعلیقا بلاغه عوسمانییه» دایناوە. نووسەر دواتر کۆی ئەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی کرابوون لە پەرتوکێکدا بەناوی«حال التعلیقات» بەرپەرچداوەتەوە. ناوبرا لەگەڵ نووسەری تورک (شیناسی) کە لە ژیاندا بووە کەوتووەتە مشتومڕێکی زمانەوانییەوە، کە ئەوەش بووەتە سەرەتا و دەستپێکێکی نوێ لەو بوارەدا لە ئەدەبیاتی عوسمانیدا.[٣]

لەبارەی دیارترین دانراوەکانی عەبدولڕەحمان سورەیا، لە تۆماری فەرمی ژیاننامەی ناوبراو، لە تۆماری گشتی دەوڵەتدا هاتووە کە: «اخوت عسکریه، تعلیقات بلاغت عثمانیه، تحلیل حل، میزان البلاغه، سفینه البلاغه) لەگەڵ وەرگێڕانی (اقوم المسالك فی معرفت احوال ممالك)دا بە مۆڵەتی فەرمی شەش

1 BOA. ŞD. 647.46.02.

2 Kazım Yetiş, a. g. m.

3 Kazım Yetiş, a. g. m.

پەرتووكی داناوە و چاپ و بڵاوكردووەتەوە.»[1] هەروەها نووسەری پەرتووكی» دانەرانی عوسمان» ئاماژەی بەوە كردووە كە ئەم دانراوانەی عەبدولڕەحمان سورەیا چاپكراون: میزان البلاغە، سفینە بلاغت، فضائل عسكریە، تعلیقات بلاغت عثمانیە، راحة الارواح- مقدمە مثنویە شرح)، لەگەڵ(برهان الثاقب فی اثبات الواجب)، كە پێكهاتووە لە وەرگێرانی (اقوم المسالک)[2].

**لێرەدا هەوڵدەدەین بەشێوەی كرۆنۆلۆژیی و بەكورتی دیارترین بەرهەمەكانی عەبدولڕەحمان سورەیا بناسێنین:**

١. مقدمەی اقوم المسالک ١٢٩٦ک/١٨٧٨ - ١٨٧٩ز لە ئەستەنبوڵ چاپكراوە، بە لەبەرچاوگرتنی ساڵی چاپ و بڵاوكردنەوەی ئەم دانراوە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت، كە ئەمە یەكەمین دانراوی چاپكراوی عەبدولڕەحمان سورەیا بووە، واتا ناوبراو سەرەتا بە كاری وەرگێڕان لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی عوسمانی دەستیپێكردووە، ئەمە بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئەم پەرتووكە لە بنەڕەتدا بریتییە لە وەرگێڕانی پێشەكی پەرتووكی(اقوم المسالک فی معریفە الاحوال ممالک)ی كۆچكردوو سەدری ئەعزەمی پێشوو خەیرەدین تونسی بووە، پەرتووكەكە، دانراوێكی گرنگی عەرەبی لەمەڕ سیاسەت و حیكمەتی حكومەت بووە، هەتا ئەوكاتە تاقانە پەرتووک بووە لەوبارەوە بە زمانی عوسمانی، چاپی عەرەبی پەرتووكەكە لە ساڵی (١٢٨٤ک/ ١٨٦٧- ١٨٦٨ز) لە تونس چاپكراوە.[3] شایەنی باسە من گەڕام بۆ بەدوای ئەم پەرتووكەدا، بەڵام نەمتوانی دەستیبخەم

٢. **اخوت عسكریە:** ئەم پەرتووكە لە (٨٠) لاپەڕە پێكهاتووە و لە ساڵی (١٢٩٨ک/ ١٨٨١ز) لەلایەن چاپخانەی (جریدە عسكریە)وە لە ئەستەنبوڵ چاپ و بڵاوكراوەتەوە. بەلەبەرچاوگرتنی ساڵی چاپ و بڵاوكردنەوەكەی وادەردەكەوێت دووەم دانراوی چاپكراوی عەبدولڕەحمان سورەیا بێت. ناوبراو ئەم پەرتووكەی ئەوكاتە نوسیووە كە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (جریدە عسكریە) بووە. (اخوت عسكریە) لە بنەڕەتدا بەمەبەستی پەروەردەی مەعنەوی سەربازەكان نووسراوە،

1 BOA. DH. SAIDd. 76. 91. H.29-12-1257.

2 Bursalı Mehmed Tahir Bey, a. g. e, s.46

٣ هەمان سەرچاوە.

وەک ناوبراو لە پێشەکی پەرتووکەکەیدا ئاماژەی پێکردووە، تاوەکو ئەوکاتە لەسەر بواری پەروەردەی مەعنەویی و پەیوەندی نێوان سەرباز و ئەفسەر لە دەوڵەتی عوسمانیدا پەرتووک نەبووە و ئەمە بووە بە یەکەمین هەوڵ لەو بوارەدا. دیسان وەکو خۆی ئاماژەی پێکردووە کە ناوەڕۆکی ئەم پەرتووکە بەشێوەی وتار لە ڕۆژنامەی (عسکریە)دا بڵاوکردووەتەوە. پێویستە ئەوەش بڵێین، ئەم پەرتووکە دانەرەکەی دەکاتە پێشەنگ لە بواری نووسەرانی پەروەردەی سەربازی، وەک خۆی دەڵێت یەکەم کەس بووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا لای بەلای پرسێکی وەها گرنگی لەبیرکراو بکاتەوە و لەسەری بوەستێت و پەرتووکی لەبارەوە دابنێت.[1]




٣. تعلیقات بلاغت عثمانیه، ئەم پەرتووکە لە ساڵی(١٢٩٩ک/ ١٨٨٢ز) لە چاپخانەی(جریدە عسکریە) بۆ یەکەمجار لە ئەستەنبوڵ چاپکراوە. پەرتووکەکە دانراوێکی بچووکە لە (٥٩) لاپەڕە پێکهاتووە، بریتییە لە ڕەخنە و لێکدانەوە لەسەر پەرتووکی (بلاغت عوسمانیە)ی ئەحمەد جەودەت. سەبارەت بە هۆکاری پشت نووسینی ئەم پەرتووکە، خۆی لە پێشەکی ئەم پەرتووکەدا باسی لەوە کردووە:» کە شەوێک لە دانیشتنێکی برایانە و ئەدەبیانەدا مشتومڕی ئەدەبیان کردووە،

١ عبدالرحمن ثریا محرر جریدە عسکریە، اخوت عسکریە، برنجی دفعە اولەرق جریدە عسکریە مطبعەسندە طبع اولنمشدر، استانبول ١٢٩٩.

باس هاتووەتە سەر ئەوەی تاقانە بەرهەمی درەوشاوە و لێهاتووانەی (بلاغت عثمانیە)، باس لەوە کراوە وەها پەرتووکێکی گرنگ و پڕبایەخ لەلایەن ئەدیبانی سەردەمەوە دووچاری جۆرێک لە پشتگوێخستن بووە، ئیدی نووسینی کۆمێنتاریی و لەسەر نووسینی دانراوی ناوبراو خرایە ئەستۆی من، هەرچەندە چەند جارێک ئەوەم گوتووە کە لەچوارچێوەی توانا و تاقەتی من بەدەرە، بەڵام نیشاندانی مکوڕیی و جەختکردنەوەی دۆستان لەوبارەیەوە، ئیدی بواری پۆزشهێنانەوەیان بۆ نەهێشتمەوە...»[1]

وەک دەردەکەوێت هەتا ئەوکاتە کەسێک لەسەر ئەو بەرهەمە گرنگ و پڕبایەخەی بواری ڕەوانبێژی عوسمانی نەنووسیوە و خۆی لە قەرەی نەداوە، دواتر عەبدولڕەحمان سورەیا ئەم پەرتووکەی لە بابەت ڕەخنە و سەرنج لەمەڕ ئەو پەرتووکە نوسیووە. وەک دەردەکەوێت ئەم نووسینەی ناوبراو، مشتومڕی بەدوای خۆیدا هێناوە. کەسێک پەرتووکێکی بەناوی (حل تعلیقات) لەسەر ئەم دانراوەی عەبدولڕەحمان سورەیا نووسیوە و ڕەخنەی لێگرتووە. دواتریش عەبدولڕەحمان سورەیا بە پەرتووکێکی دیکە وەڵامی ئەو پەرتووکەی داوەتەوە و ناوی لێناوە(تحلیل حل).


Belediye
(Osmanlıca)
K.281ig2
تعلیقات بلاغت عثمانیه

مؤلفی جریدهٔ عسکریه محرری
عبدالرحمن ثریا

= برنجی دفعه اوله‌رق =

« معارف نظارت جلیله‌سنك رخصتیله »
جریدهٔ عسکریه مطبعه‌سنده طبع اولنمشدر

هر حقی مؤلفنه عائددر

استانبول

۱۲۹۹
İSTANBUL BÜYÜKŞEHİR BELEDİYESİ ATATÜRK KİTAPLIĞI

---

١ عبدالرحمن ثریا، تعلیقات بلاغت عثمانیە، برنجی دفعە اولەرق معارف نظارت جلیلەسنک رخصتیلە، جریدە عسکریە مطبعەسندە طبع النمشدر، استانبول ١٢٩٩.

٤. تحلیل حل: ئەم پەرتووکە پێکهاتووە لە (٨٥) لاپەڕە و لە ساڵی(١٢٩٩ک/ ١٨٨٢ز) بۆ یەکەمینجار لە چاپخانەی (مهران) لە ئەستەنبوڵ چاپ و بڵاویکردووەتەوە.[١] عەبدولڕەحمان سورەیا(مەردۆخیزادە) ئەم پەرتووکەی لە بەرانبەر ئەو وەڵامانەدا نووسیوە کە لە ڕەخنەی پەرتووکی(بلاغت عثمانیە)دا دراوەتەوە. ناوبراو سەبارەت بە نووسینی ئەم پەرتووکە لە پێشەکییەکەیدا بەمشێوە باسی لێوەکردووە:» وەک ڕەخنەیەک لەسەر پەرتووکی (تعلیقات)کەمان پەرتووکێک بەناوی (حل تعلیقات) دەرچوو، وەک لەسەر پشتی پەرتووکەکە دەردەکەوێت، ئەو پەرتووکە لەلایەن یەکێک لە قوتابیانی مەکتەبی حقوقەوە نووسراوە! سەرلەبەری نووسینەکە لە ساختەکاری پێکهاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەب و حەقیقەت لە ئێمە دەخوازێت کە وەڵامی (حل) بدەینەوە و لەبەریەک هەڵیوەشێنینەوە. ئەمە بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە پەتووکەکەی ئێمە چەند جێگەی ڕەزامەندیی و پەسن و ستایشی ئەدیبەکان بووە.... لەبەرئەوەی ئێمە وەک خاوەنی(حل) ئەرگیۆمێنتەکانمان لەسەر بنەمای بانگەشە بینا نەکردووە، بۆ هەر بابەتێک بەڵگەی بەکەڵک و باوەڕپێکەرمان هێناوەتەوە... لەگەڵ ئەوەدا ئێمە لێرەدا بۆ سوودگەیاندن بە نەوەکانی نیشتیمان و بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە وەڵامی یەک بەیەکی ئەو ڕەخنانە دەدەمەوە.»[٢]




١ عبالرحمن ثریا، تحلیل حل، برنجی دفعه اولەرق معارف نظارت جلیلەسنک رخصتیلە طبع ولنمشدر، مهران مطبعەسی، استانبول ١٢٩٩.

٢ عبالرحمن ثریا، تحلیل حل، دیباجە، ص ٢-٣.

٥. میزان البلاغە: لە بەرگی پەتووکەکەدا دیارە ئەم پەرتووکەی عەبدولڕەحمان سورەیا لە(١١ی مانگی سەفەری ساڵی١٣٠٣کۆچی/ ١٩ی تشرینی دووەمی ١٨٨٥ز) بە مۆڵەتی فەرمی وەزارەتی مەعاریف لە چاپخانەی (جریدە عسکریە) لە ئەستەنبوڵ چاپکراوە و پەرتووکەکە لە(٤٠٥) لاپەڕە پێکهاتووە.[١] بەرلە هەرشتێک، ئەم پەرتووکە لەڕووی قەبارەوە لە هەموو پەرتووکەکانی دیکەی نووسەر گەورەترە و لە کۆتایی پیشەکی ئەم پەرتووکە ناوبراو نازناوی (میردۆخی زادە) ی لە پێش ناوەکەی خۆیەوە نووسیوە.

شایەنی باسە ئەم پەرتووکە، بووەتە جێگەی ڕەزامەندی و پەسن و ستایشی وەزارەتی مەعاریفی عوسمانیش، ئەوەتا لە نووسراوێکی وەزارەتی مەعاریف کە بە ژمارە (١٩٥) لە بەرواری(١٢ی ڕەبیعولئاخەری ١٣٠٣ک/ ١٨ی کانونی دووەمی ١٨٨٦ز) کە بۆ سەدارەتی عوسمانی نێردراوە، هاتووە:» مامۆستای بەڵاغەتی مەکتەبی حقوق عەبدولڕەحمان سورەیا، ئەمجارە پەرتووکێکی بەناوی(میزان بلاغت) نوسیووە و نووسخەیەکی هاوپێچ بۆ ناردووین، دانراوی ناوبراو، شایەنی پەسن و پێزانینە و دانراوێکی دانپێدانراوە، ئەگەر بووبە شایەنی پەسن و پێزانینی جەنابتان داواکارین بەوشێوەی بە گونجاوی دەزانن دانەرەکەی خەڵات بکرێت.» هەر بەگوێرەی ئەو پەراوێزانەی لەسەر نووسراوەکەی وەزارەتی مەعاریف لەبارەی خەڵاتکردنی نووسەری پەرتووکەکەوە نووسراوە، ئاماژە بەوەکراوە کە لەپای ئەم کارەی پلەی دووەمی(متمایز)ی پێ بدرێت.[٢] لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ناوبراو ئەوکات ئەم پەرتووکەی نوسیووە لە مەکتبەی حقوق لە ئەستەنبوڵ مامۆستای وانەی بەلاغەت بووە.

هەروەها پەرتووکی(میزان البلاغە) بەگوێرەی بۆچوونی شارەزایانی بوارەکە، یەکێکە لە پەرتووکە بنەڕەتییەکانی بواری بەلاغەتی عوسمانی. ئەم پەرتووکە جێگەیەکی تایبەتی لەناو ئەو پەرتووک و دانراونەدا هەیە کە لە بواری بەلاغەتی

---

١ جریدە عسکریە فنون قسمی سر محرری میردوخی زادە عبد الرحمن ثریا، میزان البلاغە، معارف نظارت جلیلەسنک ٣٩٧ نومرلو رخصتنامە سیلە جریدە عسکریە مطبعەسندە طبع اولنمشدر، استانبول، فی ١١ صفر ١٣٠٣.

2 BOA. MF.MKT 89.99.01.

عوسمانیدا نووسراون، چونکە نووسەر لەبری پێوانی بەلاغەتی عوسمانی بە بەلاغەتی عەرەبی لە هەوڵی نووسین و دانانی بەلاغەتی تایبەت بە زمانی عوسمانیدا بووە.[1]

سەبارەت بە ناوەڕۆکی پەرتووکەکە، دانەر پەرتووکەکەی لە شێوەی وانەدا دایڕشتووە، `بەکۆی گشتی لە(سی و نۆ) وانە پێکهاتووە، تێیدا بابەتەکانی ڕەوانبێژیی و ڕیتۆریکی: پێناسە و ماناکانی فەساحەت، ضعف تالیف، فن بلاغت، ترکیب الفاض، ارکان کلام (امر، نهی، تحضیض، ردع، تحذیر، تمنی)، ندا، منادی، استخبار، استفهام، استطراد، استغراب، خبر، مسند الیه، استطراد، متممات کلام، قصر، ایجاز، وصل و فصل، ادات عطف، دخی، که، ینه ایمدی، لکن، بلکه، فن بیان، مجاز لفظی، تشبیه، استعاره، فن بدیع، تصبی، ادب کلام، تجنیس...هتد.[2] ئەم بابەتانەی بە نموونەی شیعری باس و شرۆڤە کردووە، نموونەی شیعری شاعیرانی عوسمانی هێناوەتەوە لە نموونەی:(ندیم، عاکف، نایی، فضولی، منیف، جودت پاشا، نزهت افندی، ابن کمال، راغب، باقی، عزت ملا ... هتد)، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئاگایی و شارەزای ناوبراو لە ئەدەبیات و شیعری عوسمانیدا. پێویستە ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین، بە بەراورد بە شاعیرانی دیکە، نموونە شیعرییەکانی بە ڕێژەیەکی زۆرتر لە شیعرەکانی نەفعییەوە وەرگرتووە، کە شاعیرێکی کورد بووە.[3] لە دەرفەتێکی دیکەدا ڕوونکردنەوە لەسەر ئەم شاعیرە دەدەین.

---

1 Kazım YetiŞ, a. g. m.

٢ جریده عسکریه فنون قسمی سر محرری میردوخی زاده عبد الرحمن ثریا، میزان البلاغه، معارف نظارت جلیلەسنک ٣٩٧ نومرلو رخصتنامه سیله جریده عسکریه مطبعەسندە طبع اولنمشدر، استانبول، فی ١١ صفر ١٣٠٣.

٣ بڕوانە : میزان البلاغە.



میزان البلاغه

مؤلفی

جریدهٔ عسکریه فنون قسمی سرمحرری میر دوخی زاده

عبدالرحمن ثریا

معارف نظارت جلیله سنك ۳۹۷ نومرولی

رخصتنامه سیله جریدهٔ عسکریه مطبعه سنده

طبع اولنمشدر

استانبول

فی ۱۱ صفر ۱۳۰۳

721

BELEDIYE

K/652

٦. سفینه بلاغت: وەکو لە زانیارییەکانی سەر بەرگی پەرتووکەکەوە بەدیار دەکەوێت، ئەم پەرتووکە لە ساڵی(١٣٠٥ک/ ١٨٨٨ز) لە چاپخانەی (ابو الضیا) لە ئەستەنبوڵ چاپکراوە. پەرتووکەکە لە(٢٠٠) لاپەڕە پێکهاتووە، لەم پەرتووکەشدا نووسەر ناوی خۆی لەسەر بەرگ و لە کۆتایی پێشەکی پەرتووکەکەیدا نازناوی(میردۆخی زادە)ی بۆ خۆی داناوە. سەبارەت بە هۆکار نووسینی ئەم پەرتووکە، نووسەر لە پێشەکی پەرتووکەکەیدا ئاماژەی بەوەکردووە، کە لە کاتی دووەبارە گوتنەوەی پەرتووکی» میزان البلاغە» کە لە مەکتەبەی حقوقدا نووسیبووم، چەند بابەت و خاڵیکی گرنگی دیکەی ئەدەبی کە لێرە و لەوێ و پەرتەوازە بەمەبەستی سوودی گشتی نووسیبووم، بەمەبەستی گەیاندنی سوود بە ڕوونکردنەوەی تەزر و شێوازی زمانی عوسمانی لە هەموو لایەکەوە کۆکردنەوەی ئەو بابەت و ڕاپۆرتانەم بە پێویست زانی. هەروەها کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی ئەو بابەتانە و چاپکردنی لەژێر ناونیشانی» **سفینە بلاغت**» بە گونجاو زانرا،[1] چونکە هەندێکجار لەلایەن ئەوانەی بەتەواوی شارەزای زمانی تورکی نین، پێیانوایە کە زمانی عوسمانی ڕەوانبێژی(فن لسان) نییە، کە ئەمەش

١ دیباجە، سفینە بلاغت، مؤلفی: میردوخی زادە عبدالرحمن ثریا، برنجی طبع، مطبعە ابو الضیا، قسطنطینیە ١٣٠٥، ص ٥-٦.

خاڵییە لە ڕاستەقینە و بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بیروبۆچوونە ساختەی لەو شێوە و نیشاندان و نووسینی چەندان بابەتی بەسوود ئەم کارە ئەنجامدراوە.

هەر لەم پێشەکییەدا ئاماژەی بە پێویستیبوونی ئەم بەرهەمەی بۆ کایەی ڕۆشنبیری عوسمانی کردووە و ئەوەشی ڕوونکردووەتەوە کە لە چاپی یەکەمی پەرتووکی» میزان البلاغت» چەند هەڵەیەک لە چاپدا ڕوویداوە، لێرەدا ڕاستی کردووەتەوە.[1] واتا دەتوانین بڵێین، ئەم پەرتووکەش تەواوکەری پەرتووکی پێشوویەتی کە بەناوی(میزان البلاغت)ەوە چاپیکردووە و بە هەردوو بەرهەمەکە دەبنە تەواوکەری یەکتر لە پرۆژەی دامەزراندنی بنەمای ڕەوانبیژی زمانی عوسمانی.






وێنەی عەبدولڕەحمان سورەیا(مەردۆخیزادە)

---

١ دیباجە، سفینە بلاغت، ص ٧-٩.

## پێشەکی

کاتێك دەمانەوێت چەند سەرهنجێکی خێرا لەمەڕ توێژینەوەی زانستی بنووسین، پێویستمان بەوە هەیە باسی هەموو ئەو بابەتانە بکەین کە پەیوەستە بە پرۆسەی توێژینەوەی زانستییەوە، بۆئەوەی وێنەیەکی دروست بکێشین، زۆر گرنگە چاوێك بە مێژوو و پێشینەی زانکۆکان بخشێنین، بۆئەوەی بەرچاوڕوونیمان هەبێت لەوەی توێژینەوەی زانستی چۆن دەستیپێکردووە و بە چ قۆناغێکدا گوزەری کردووە، چونکە ئەوەی لە ڕۆژگاری ئێستادا هەستی پێدەکەین، درێژکراوەی قۆناغەکانی پێش خۆیەتی.

شیاوی باسە، توێژینەوەی زانستی وەك بنچینە و کۆڵەکەی سەرەکی خوێندنی باڵا و زانکۆکان، لە ئێستادا بە بارودۆخێکی نالەبار و نائاسایی تێدەپەڕێت، لەبەر ئەمەش بە پێویستمان زانی بابەتەکەمان بەناونیشانی: دیوێکی تری توێژینەوە زانستییەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخ هەڵبژێرین، کە مەبەستمانە لە دیوێکی تر و لە گۆشەنیگایەکی پسپۆڕییەوە بڕوانینە چەند لایەنێکی پەراوێزخراوی توێژینەوە مێژووییەکانی قۆناغی نوێ و هاوچەرخ. بابەتەکەمان لە پێنج تەوەرەی سەرەکی پێکدێت، تەوەرەی یەکەم: قۆناغی بەکالۆریۆس وەك بونیادێکی زانستی پەراوێزخراو، تەوەرەی دووەم: گەشتێکی خێرا بەنێو نووسینی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکان، تەوەرەی سێیەم: دیوی دووەمی توێژینەوە زانستییەکان لەنێو گۆڤار و کۆنفرانسەکاندا، تەوەرەی چوارەم: زمان وەك کۆڵەکەیەکی گرنگی توێژینەوەی زانستی، تەوەرەی پێنجەم: هۆکارەکانی پشت گرفتی توێژینەوەی زانستی.

جێگەی باسە، ئەم دۆخە نالەبار و نازانستییەی کە توێژینەوەی زانستی پێیدا تێدەپەڕێت، زادەی شەو و ڕۆژێك نییە، بەڵکو ئەمە سەرەتای ئەنجامی قۆناغەکانی پێشووترە، کە بەداخەوە نەتوانراوە لە ماوەی ئەو هەموو ساڵەدا، بونیاد و پێشینەیەکی زانستی دروست بکرێت بۆ گەشەکردنی زانکۆ و کۆمەڵگا. ئەو چەند سەرەنج و نموونە خێرایانەی دەیخەینەڕوو، تەنها بۆ ڕوونکردنەوەیە، دەنا بە دەیان و سەدان نموونەی زیندوو لەوبارەیەوە لەبەردەستدایە، دیارە ئەم پەتا نازانستییە هەر قۆناغی مێژووی نوێ و هاوچەرخی نەگرتووەتەوە، بەڵکو

مێژووی کۆن و مێژووی ئیسلامی-سەدەکانی ناوەڕاستیش پڕە لەو جۆرە نموونە و بەسەرهاتانە، تەنانەت چەند توێژینەوە و کتێبێکیش لەوبارەیەوە بڵاوکراونەتەوە، بەڵام مەبەستمان بوو زیاتر لەچوارچێوەی پسپۆڕییەوە تەماشای پرسەکە بکەین و ئارێشەکانی بخەینەڕوو.

جێگەی گووتنە، نووسینی ئەم چەند سەرەنجە خێرایە، زیاتر بەمەبەستی وروژاندنی پرسی توێژینەوەی زانستی لە زانکۆکانی کوردستان خراوەتەڕوو، کە بە پلەی یەکەم بەرپرسانی باڵا لێی بەرپرسن، کە ڕێگەیان خۆشکردووە ئەم جۆرە سیستەمە بێتەکایەوە، ئەگەرنا لە نزیکەوە ئاگادارین چەندین مامۆستای بە توانا و لێهاتوو هەن، نووسینەکانیان ڕاژەیەکی باشیان کردووە لەوبارەیەوە، خۆشبەختانە زۆر لەو مامۆستایانە بۆخۆیان دان بەو دۆخە نالەبارەی توێژینەوە زانستییەکان دەنێن و ڕەخنەی لێدەگرن.

## تەوەرەی یەکەم:

## قۆناغی بەکالۆریۆس وەك بونیادێکی زانستی پەراوێزخراوو

یەکێك لە پایە هەرە سەرەکییەکانی فێرکردنی باڵا بریتییە لە توێژینەوەی زانستی، چونکە زانکۆکان زیاتر بە چەندایەتی و چلۆنایەتی ئەو توێژینەوانە هەڵدەسەنگێنرێن(١). لە تەواوی وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیادا، توێژینەوەی زانستی پێگەیەکی گرنگی هەیە لە زانکۆدا، چونکە بە بنچینەی خوێندنی باڵا دادەنرێت(٢). دیارە پڕۆسەی توێژینەوەی زانستی، هەنگاوە سەرەتاییەکانی لە قۆناغی بەکالۆریۆسەوە دەستپێدەکات، ئەم قۆناغە وەکو هەنگاوی یەکەم و بونیادی زانستیی خوێندکار ئەژمار دەکرێت، هەر لەم قۆناغەدا ئامازەکانی توانا و بەهرەی زانستی خوێندکار بەدەردەکەوێت لەو پسپۆڕییەی تێیدا دەخوێنێت.

جێگەی باسە، لە وڵاتانی دەرەوە بایەخێکی زۆر بەم قۆناغەی خوێندن دەدرێت، لە وڵاتێکی وەکو ڕووسیادا، دایك و باوك و تەنانەت خوێندکاریش هەموو هەوڵێکیان بۆئەوەیە کە لە زانکۆیەکی باش وەربگیرێن، بۆئەوەی بتوانن خۆیان پێبگەیەنن و داهاتوویەك بۆ خۆیان دەستنیشان بکەن، بەهۆی شارەزایی




و لێهاتووییان لەو پسپۆڕییەدا. ئەوەندەی سەرنج دەدرێت، زانکۆکان لەڕووی پێداویستی و بەرنامەی خوێندنیان لە ئاستێکی بەرزدان، بەوپێیە خوێندکار ناچار دەکرێت بۆئەوەی بتوانێت دەربچێت، پێویستە ببێت بە فێرخواز و زانستخوازێکی باش لە داهاتوودا. ڕۆژانە بە لایەنی کەمەوە شەش کاتژمێر دەخوێنن، بۆیە خوێندکار لەم قۆناغەدا زۆربەی کاتەکانی ڕۆژی لە زانکۆدا بەسەر دەبات. یەکێك لەو بابەتانەی کە جێگەی سەرنجە، زۆربەی زانکۆکان لەم قۆناغەدا دەستی خوێندکار دەگرن بۆ نووسینەوەی توێژینەوەی زانستی و بەشداریکردن لە کۆنفرانسەکاندا، کە ساڵانە بە دەیان و سەدان کاری لەو جۆرە دەکرێت.

بەداخەوە لە کوردستان لەم ساڵانەی دواییدا، لە هەندێك زانکۆ خوێندکار بە کۆنمرەی شەستەوە بەشی مێژووی تەواو دەکرد، دیارە پێشتریش لە ڕێگەی وەرگرتنی تایبەتەوە ئەو کارە دەکرا، ئەمە دەستپێکی بێ بەهاکردنی پسپۆڕیی و بڕوانامە بوو. لە زۆربەی بەشە کۆمەڵایەتییەکان و بەتایبەتی بەشی مێژوو، بابەتێك بەناوی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەخوێندرێت، بۆئەوەی خوێندکار فێری هەنگاوە سەرەتاییەکانی توێژینەوەی زانستی بێت. دواتریش لە قۆناغی چوارەم، بابەتێك بەناوی توێژینەوەی دەرچوون هەیە، وەکو بەشێك لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس. بەداخەوە کەمترین بایەخ بەم وانەیە دەدرێت، لەکاتێکدا پێویستە زۆرترین کاتی بۆ تەرخان بکرێت، چونکە ئەمە بنەڕەت و پێشینەی هەنگاوی سەرەتاییە بۆ خوێندکار، بۆئەوەی بە باشی هەنگاوی یەکەمی توێژینەوەی زانستی فێربێت.

شیاوی باسە، زۆرجار هەڵسەنگاندنەکان لەم قۆناغەدا زانستی نین، بەڵکو پرسگەلێکی وەکو ئایدۆلۆجیا و پارتایەتی و پەیوندی کەسیی ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لەوبارەیەوە. هەربۆیە زۆرجار دەبینین لە لایەن چەند مامۆستایەکەوە، هەوڵدەدرێت بەمەبەستەوە خوێندکارێك بکرێت بە یەکەم، یاخود بەهۆی کێشەی کەسی و ئایدۆلۆجییەوە، ستەم لە خوێندکارێکی تر دەکرێت. مامۆستایەك دەیگێڕایەوە، لە قۆناغی بەکالۆریۆس کۆنمرەی حەفتا بووە، بەڵام دوایی کردوویانە بە شەست و نۆ، بۆئەوەی لە ماستەر

وەرنەگیرێت، دیارە ئەو کاتە کۆنمرەی حەفتا پێویست بوو. دواتر لە ڕێگەی مامۆستایەکی بەشەوە پێی وتبوو بۆیە وایان کردووە، چونکە وتوویانە باوکی سەر بە پارتێکی ترە. جاری وا هەیە بەهۆی ململانێی نێوان مامۆستاکانەوە، کاریگەرییەکانی لەسەر خوێندکارانیش ڕەنگدەداتەوە، بۆ نموونە مامۆستایەك پێی خۆش نییە سەرچاوەی فڵانە مامۆستای هاوپسپۆڕی بەکاربهێنرێت لە توێژینەوەی دەرچووندا!

شیاوی باسە، قۆناغی بەکالۆریۆس زۆر گرینگرە لە خوێندنی ماستەر و دکتۆرا، چونکە دەکرێت خوێندکار لەم قۆناغەدا دروستبکرێت و خۆی پێبگەیەنێت، لە هەموو دونیاش زۆرترین بایەخ بەم قۆناغە دەدرێت، بەوپێیە خوێندکار دەتوانێت بونیادی هزریی و فەرهەنگی خۆی دروستبکات، چونکە لەڕووی تەمەنەوە دەتوانێت زۆرباشتر بابەتەکان هەرس بکات، پاشان بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی تر، زۆرترین ماوە لەگەڵ پسپۆڕییەکەی خۆیدا دەباتە سەر، هەربۆیە کار و پڕۆژەکانی داهاتووی هەموو توێژەر و پسپۆڕێکی مێژوو، دەگەڕێتەوە بۆ چۆنییەتی خوێندنی زانکۆ، هەرسکردنی بابەتەکان و فێربوونی ئەزموونەکانی ئەم قۆناغە گرنگ و هەستیارە لەلایەن مامۆستایانی بە تواناوە. هەربۆیە پێویستە مامۆستا زۆر بەوردی و لەسەر بنەمای زانستی هەڵسەنگاندن بۆ خوێندکار بکات و دوور بێت لە کاریگەری ئایدۆلۆجیی و پارتایەتی و کێشە و پەیوەندی کەسێتی. دواتر ئەم هەنگاوە دەبێت بە بونیادێکی زانستی گرنگ بۆ کار و پڕۆژەکانی داهاتووی خوێندکار.

لەم قۆناغەدا مامۆستا و پاشان سیستەم و بەرنامەی خوێندن لە بەشی مێژوو، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە بونیادنانی زانستی و پێشینەی فەرهەنگی خوێندکار، بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا، زۆربەی بەشەکانی مێژووی زانکۆکانی کوردستان، ناتوانین هیوایان لەسەر هەڵبچنین، چونکە جگەلەوەی کە زۆر لە مامۆستایان بە کۆنمرەیەکی کەمەوە بوونە بە مامۆستا، بەڵکو تێیاندایە پسپۆڕیی لە مێژوویشدا نییە. ئیدی چۆن دەکرێت چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت پسپۆڕی مێژوو و توێژینەی زانستی بەرەو پێشەوە بەرێت؟!

## تەوەرەی دووەم:

## گەشتێکی خێرا بەنێو نووسینی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکان

لەم تەوەرەیەدا هەوڵدەدەین بەشێوەیەکی گشتی هەندێك سەرنجی خێرا لەمەڕ پرۆسەی نووسینی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکان بنووسین کە تایبەتن بە مێژووی نوێ و هاوچەرخەوە. پێش هەموو شتێك، ئەوەی سەرنج دەدرێت لە زانکۆکانی کوردستاندا، سەرپەرشتیار ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە نووسینەوەی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکان، بەتایبەتی بۆ ئەو خوێندکارانەی کە پێشینەیەکی زانستی و فەرهەنگیی باشیان نییە، ئەمەش لەکاتی خوێندنەوەی توێژینەوەکان بە زەقی هەستی پێدەکرێت، هەربۆیە بە لای منەوە توێژەر لەمبارەدا، ناتوانێت ببێت بە خاوەنی ڕەهای ئەم کارە ئەکادیمییە، بەڵگەش بۆ ئەمە زۆرجار دەبینین توێژەر نە پێشتر و نە دواتریش توانای کارێکی هاوشێوەی نییە بۆ بڵاوکردنەوە. لە زۆربەی وڵاتانی دەرەوە، سەرپەرشتیار تەنها وەکو هێما و ناوێك بۆ توێژەر دادەنرێت، دەنا هەموو ئەرکە زانستییەکان لە ئەستۆی خوێندکار خۆیەتی.

جێگەی هێما بۆکردنە، لەم ساڵانەی دواییدا لە هەندێك بەشی مێژوو پرۆپۆزەڵ ئامادە دەکرا بۆ خوێندکار، دەبوو خوێندکار بەپێی ئەو ناونیشانانەی دیاریکراوە، توێژینەوەکە بنووسێت. ئەمەش ستەمێکە بەرانبەر بە حەز و خوولیا و توانای خوێندکار، کە خاڵی سەرەکی سەرکەوتنی توێژینەوەکەیە، چونکە بەبێ ئارەزوولێبوون، توێژەر ناتوانێت هیچ توێژینەوەیەك بەئەنجام بگەیەنێت(٣). هەڵبژاردنی خوێندکار بۆ بابەتی توێژینەوە، لەڕاستیدا خۆی بەرپرسیارە، مامۆستای سەرپەرشتیار ئاڕاستەی دەکات و سەرپەرشتی دەکات بۆ سەرچاوە و ژێدەر و شێوازی کارکردن(٤). زۆرجار دەبینین لە دەرەوەی توانای توێژەر بابەت دەستنیشان دەکرێت، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کە زانینی زمانی دووەم تێیدا ڕۆڵی گرنگ و سەرەکی دەبینێت، هەربۆیە لەمکاتانەدا توێژەر پەنا بۆ کەسانی تر و بەفیڕۆدانی پارەیەکی زۆر دەدات لەوبارەیەوە، یاخود زۆرجار هانا بۆ سەرچاوەی پلە دوو و سێ دەبات، کە تێیدا توانا و بەهرەی توێژەر بزر دەبێت. پرسیار لێرەدا ئەوەیە: ئایا چ پاڵنەر و ئامانجێکی زانستی لە پشت ئەم جۆرە کارانەوەیە؟ ڕاستە بابەتی نوێ و تازە گرنگە، بەڵام توانست و زاڵبوون بەسەر بابەتەکەدا لەوە پێویستترە.

هەرچی تایبەتە بە پسپۆڕی مێژووی نوێ و هاوچەرخەوە، ئاشکرایە مەبەست لە مێژووی نوێ ماوەی نێوان سالانی (١٥١٤-١٩١٤)، مێژووی هاوچەرخیش لە پاش ساڵی (١٩١٤)ەوەیە. ئەوەی سەرنج دەدرێت زۆربەی زۆری بابەتەکان لە بواری مێژووی ڕامیاری کورد نووسراون و زیاتر لە سەدەی بیستەمدان(٥). بەداخەوە هەندێك لە بابەتەکان زۆر دوورن لە بابەتی مێژووییەوە. (مرۆڤ، شوێن، کات) وەکو سێ ڕەگەز و پێکهاتەی مێژوو(٦)، پێویستە لە ناونیشان و دیاریکردنی ماوەی مێژوویی توێژینەوەکە بایەخی پێبدرێت و پشتگوێ نەخرێت. ئاشکرایە بابەتی مێژوویی، ئیدی شوێنی جوگرافی، کەسایەتی و کات و ڕووداو و یاخود بزووتنەوە و بابەتێکی مێژوویی بێت، دەبێت گوزارشت لە قۆناغێکی مێژوویی بکات، کاریگەری بەجێهێشتبێت لە نێوان قۆناغی پێش خۆی و پاش خۆی. بەڕاستی هەندێك لە کەسایەتییەکان سەرنج دەدرێت هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆیان بەجێنەهێشتووە لەڕووی مێژووییەوە.

ئاخر ناکرێت ڕۆڵی کەسایەتییەك لە نووسینەوەی مێژوو بخەیتەڕوو، کە جگەلە نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکەی، خاوەنی هیچ کتێبێکی مێژوویی نەبێت. هیچ نووسەرێك بە کتێبێك و دووان نابێت بە مێژوونووس، هەتا ڕۆڵی هەبووبێت لە نووسینەوەی مێژوودا. جگەلەوەش، زۆر جاران مێژوو لەگەڵ زانستی ڕامیاری تێکەڵ دەکرێت، لەکاتێکدایە پێویستە بیست ساڵێك بەسەر ڕووداوەکە تێپەڕێت(٧). جێگەی داخە، لەمبارەیەوە هەست و سۆز و پەیوەندییەکان زاڵ دەبێت بەسەر هەڵبژاردنی ناونیشانی توێژینەوەکان. ئەگەر سەیرێکی زانکۆکانی عێراق بکەین، سالانە چەندین ناونیشانی تازە و بەپێز لەوبارەیەوە دەنووسرێت، لەمەڕ بابەتی کارگێڕیی و فەرهەنگی. بۆ نموونە: (کارەبا لە عێراق هەتاوەکو ساڵی (١٩٥٨)-توێژینەوەیەکی مێژووییە)، ساڵی (٢٠١٦) پێشکەشکراوە(٨). لەگەڵ ئەمەشدا تاك و تەرا ناونیشانی وەهاش دەبینرێت کە دوور بێت لە بابەتی مێژوو، وەکو (ئەحمەد ڕازی-توێژینەوەیەکە لە ژیاننامەی وەرزشیی و کاریگەری کۆمەلایەتی و پەلەمانی (١٩٦٤-٢٠٢٠)، ساڵی (٢٠٢٣) پێشکەشکراوە(٩). جێگەی باسە، ئەم ماستەرنامەیە لە بواری مێژووی نوێ و هاوچەرخدا، لەلایەن مامۆستایانی زانکۆ و ئەکادیمییەکانەوە ڕەخنەیەکی زۆریان لێگرت. دەکرێت



بچووكترین سەرنج لەوبارەیەوە ئەوە بێت، ئایا دەكرێت نووسینەوەی مێژوو باس لە سێ ساڵ بەر لە ئێستا بكات؟ وەك لە ناونیشانەكەدا هاتووە.

بەشێوەیەكی گشتی، زۆر لەو بابەتانەی نووسراون، مۆركی پارتایەتی و ئایدۆلۆجی و ناوچەگەریی زەقیان پێوە دیارە، بۆ نموونە كەم دەبینرێت توێژەرێك لە ناوچەی سلێمانی نامەی ماستەر یاخود تێزی دكتۆراكەی بۆ بابەتێك لە شۆڕشی ئەیلوول و سەركردە و كەسە ڕامیارییەكانی ئەو دەڤەرە تەرخان بكات، هەروەك نابینرێت توێژەرێك لە دەڤەری هەولێر و دهۆك لەمەر شێخ مەحموودی حەفید و قۆناغەكانی تری ئەو ناوچەیە بنووسێت. هەڵبەت زۆرجار ئەمە بۆ نووسینی ناوچە و دەڤەرێكیش هەر ڕاستە.

دەگێڕنەوە توێژەرێك لە نامەی ماستەرەكەیدا، كتێبی سەركردەیەكی كوردی بەكارهێناوە وەكو سەرچاوە، كە نووسەر تێیدا ڕەخنەی لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد گرتبوو، پاش گفتوگۆكردن و واژۆكردنی ئەندامانی لیژنە، دیارە بە ڕاگریان وتووە. ڕاگری كۆلێجیش بە توێژەری وتووە ئەو وتەیە بسڕەوە دەنا واژۆی ناكەم. توێژەر وتوویەتی نامەكە گفتوگۆی لەسەر كراوە، پاشان ئەوە سەرچاوەكە و ئەوەش وتەی سەركردەكە، قسەی زیادم نەكردووە، ڕاگر پێیوتووە من ئەوە نازانم بیسڕەوە(١٠).

ئەوەی جێگەی تێڕامانە، لە مێژووی نوێ و هاچەرخ، كەمترین بابەت لەمەڕ مێژووی ئەوروپا و ئاسیا و وڵاتانی عەرەبی دەبینرێت. بە چەشنێك كاتێك چاو بەو توێژینەوانە دەگێڕیت، وا هەست دەكرێت مێژووی نوێ و هاوچەرخ بریتییە لە مێژووی ڕامیاریی كورد لە سەدەی بیستەم!

هەرچی تایبەتە بە شێوازی نووسین و پلان و بەكارهێنانی ڕێبازی توێژینەوەی مێژوویی، كاتێك ئەو نامەی ماستەر و تێزی دكتۆرایانە سەرنج دەدەین، هێڵێكی گشتی و هاوبەش دەبینرێت لە شێوازی نووسینی لێكۆڵینەوەی مێژوویی، یەكێك لەو خاڵانە وەكو وتمان ڕووداوی مێژوویی پلە یەك نین، بەڵام هەوڵدەدرێت بە زۆر یاخود وەك لاستیك ڕادەكێشرێت بۆ ئەوەی بكرێت بە ڕووداوی مێژوویی و كەسایەتی مێژوویی، هەڵبەت كۆمەڵێك هۆكاری نازانستی لە پشت ئەم بەزۆركردنی مێژووە هەیە. بۆ نموونە لەم بارەدا دەروازە یاخود

ڕێخۆشکردنێکی دوورودرێژ لەوبارەیەوە دەنووسرێت کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بابەتی توێژینەوەکەوە نییە، بەڵکو تەنها بۆ فراوانکردن و زیادکردنی ژمارەی لاپەڕە و سەرچاوەکانە. لەکاتێکدا کەسایەتی مێژوویی وەکو پاڵەوان و سەرکردەی مێژوویی، پێویستە هەوڵ و خەباتی ئەو کەسە، جۆرە دابڕانێکی مێژوویی دروستکردبێت لە نێوان قۆناغی پێش خۆی و پاش سەردەمەکەی. گومان لەوەدا نییە، ئەم جۆرە کارانە، پێش هەموو شتێك زیان بەو ڕۆڵە کەمەی کە هەیبووە دەگەیەنێت، هەتا وایلێدێت بە چاوی گومانەوە بڕوانرێتە ئەو هەوڵ و ڕۆڵە کەمە ڕاستەقینەشی کە هەیبووە. لە پاڵ ئەمەشدا، ڕۆڵی چەندین کەسایەتی و بابەتی مێژوویی گرنگ بەمەبەستەوە پەراوێز دەخرێت و ڕێگەیان پێنادرێت. یاخود زۆرجار بابەتی گرنگ و بایەخدار لە لایەن زانکۆکانی عێراقەوە لەمەڕ مێژووی خۆمان دەنووسرێت، بۆ وێنە: ساڵی (٢٠٢٣) نامەی ماستەرێك هات بە ناونیشانی: زانکۆی سلێمانی (١٩٦٨-١٩٩٢)-توێژینەوەیەکی مێژووییە(١١). پرسیار لێرەدا ئەوەیە، بۆچی لەو ماوە زۆرە هیچ زانکۆیەکی کوردستان بیری لەم ناونیشانە نەکردووتەوە؟ لەکاتێکدا ئەمە ئەزموونێکی زانستی بایەخدارە لە مێژووی فەرهەنگیمان. وەکو مێژوونووس و کەسایەتی ڕامیاریی و فەرهەنگی چەندین کاری ئەکادیمیی لەمەڕ کەسایەتی کوردییەکان کراوە، بۆ وێنە لەبارەی: پ.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد(١٢)، پ.د. موحسین موحەممەد حوسێن١٣)، مەسعود محەمەد(١٤)، موکەڕەم تاڵەبانی(١٥).

وەکو باسمانکرد، بایەخێکی زۆر بە دەروازە یاخود بابەتی پێشوو دەدرێت، لە وڵاتانی تری دونیادا کەمتر ئەم شێوازە دەبینرێت، چونکە توێژەر ڕاستەوخۆ دەچێتە نێو باسە سەرەکییەکەوە. ناوەڕۆك و شێوازی نووسینەکان، لەڕاستیدا زۆر ماندووکەرن. بەشێوەیەکی گشتی لە کوردستان بەهۆی زۆری پەراوێز و دانانی سەرچاوەی زۆرەوە، زۆرجار ناوەڕۆکی بابەتەکە لاواز دەکات، چەندینجار وا ڕێککەوتووە لە لاپەڕەیەکدا، چەند دێرێکی کەم لە ناوەڕۆکی بابەتەکە دەبینین، نیوەی زیاتری بەشی پەراوێز، سەرچاوە، ڕوونکردنەوە، ناساندنی ناوی کەسایەتی و شوێنە. پرسیار ئەوەیە: کێ ئەم جۆرە بابەتانە دەخوێنێتەوە بە خاوەن پسپۆڕییەکانیشەوە؟

سەبارەت بە بەکارهێنانی سەرچاوە، دیارە بەکارهێنانی سەرچاوە لایەنێکی گرنگە، چونکە بەشێك لە کاری توێژەر، گەڕان و کنە و پشکنینە بە دووی ئەو سەرچاوانەی لەوبارەیەوە نووسراون. لێرەوە ئاست و توانا و شارەزایی خوێندکار بەدیار دەکەوێت، تا چ ئاستێك لەو بابەتەدا قووڵبووەتەوە. ئاشکرایە لێهاتوویی توێژەر و سەرکەوتنی توێژینەوەکە، بەشێکی گرنگ و سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ زانینی زمان و زاڵبوونی بەسەر زمانە بیانییەکاندا. بێگومان زانینی زمان خاڵێکی زۆر بەهێزە بۆ سەرکەوتنی توێژەر. ئەگەر توێژەر بابەتێك لەمەڕ کوردستانی تورکیا هەڵبژێرێت و زمانی تورکی یاخود شێوەزاری کرمانجی سەروو نەزانێت، دیارە پڕ کەموکوڕی دەبێت(١٦). هەروەکو چۆن ڕۆژهەڵاتناسێك زۆر سەرکەوتوو نابێت ئەگەر لەمەڕ پرسی کورد بنووسێت و ئاگاداری زمانی کوردی نەبێت. مێژوونووسێکی وەکو (جەلیلی جەلیل) لای وایە بۆئەوەی سەرچاوەی پێویست پەیدا بکەین، دەبێت بە لایەنی کەمەوە (١٣) سیازدە زمان، ڕووسی، ئینگلیزی، فەڕەنسی، ئەڵمانی، ئیتاڵی، ئەرمەنی، عەرەبی، فارسی و تورکی هەروەها هەموو شێوەزارە سەرەکییەکانی زمانی کوردی بزانێت، تەنها لەوکاتەدا زانا دەتوانێت بڵێت: (من مێژوونووسم)(١٧). هەرچۆنێك بێت، زانینی زمانی شوێنی جوگرافی توێژینەوەکە زۆر گرنگە بۆ توێژەر و سەرکەوتنی توێژینەوەکە.

جێگای باسە، لە زانکۆکانی کوردستاندا سەرپەرشتیار و توێژەر هەوڵدەدەن زۆرترین سەرچاوە بەکاربهێنن، زۆرجار ئەم دیاردەیە لەنێو کتێبەکانیشدا ڕەنگدەداتەوە. هیچ گومان لەوەدا نییە، کە زۆری سەرچاوەی هەمەڕەنگ بە زمانی جیاجیا، کارێکی سەرەکی سەرکەوتنی توێژەرە، بەتایبەتی بۆ بابەتە مێژووییەکان، بەڵام نابێت بکرێت بە بابەتێك بۆ ڕووکەش و خۆدەرخستن، چونکە زۆرینەی جار توێژەر جگە لە کوردی-کرمانجی ناوەڕاست، ڕەنگە شێوەزار و بنزارێکی تریش نەزانێت.

بەکارهێنانی سەرچاوە، بەشێکی تری پرسەکەیە، لەم ماوەیەدا کتێبێکی قەبارە گەورەی مێژوویی چاپ کرا کە لە بنەڕەتدا تێزی دکتۆرایە، لەنێو سەرچاوەکاندا فەیسبوکی بەکارهێناوە! تێناگەم لیژنەی گفتوگۆ و سەرپەرشتیار چۆن ئەمەیان قبووڵکردووە و بەسەریاندا تێپەڕیووە؟! بۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت، ئەم کارە

زانستییانە ناخوێندرێنەوە یاخود زۆر بەپەلە بەسەریاندا دەچنەوە. وانابینرێت بەراورد بکرێت لە نێوان سەرچاوەکان و شێوازی نووسینی توێژەر.

یەکێك لە پرۆسە گرنگەکانی توێژینەوەی زانستی، هەڵسەنگاندن و گفتوگۆی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکانە. لیژنەی گفتوگۆ و تاوتوێکردنی توێژینەوەی زانستی، بەرپرسیارییەتییەکی زۆر گەورەیە، دەتوانین بڵێین دادگایەکی زانستییە، بۆیە دەبێت بەرپرسانە و زانستییانە ئەم لیژنەیە دابنرێت و حسابی زۆر ورد بۆ توانست و پسپۆڕیی وردی ئەندامانی بکرێت، بەڵام بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری گفتوگۆکان، زیاتر لە شانۆگەرییەك دەچن کە لەسەرووی خۆیانەوە سیناریۆکەیان بۆ داڕێژراوە، چونکە وادەبینرێت جۆرە ڕێککەوتنێکی پێشوەختە کرابێت لەوبارەیەوە. دیارە بەشێك لە مامۆستایانی زانکۆ و کەسانی دەرەوەش هەستیان بەم یارییە کردووە و بە ڕاشکاوانە دانی پێدادەنێن. ئەوەی سەرنج دەدرێت، کۆمەڵێك کەسی دیاریکراو زۆربەی جار هەر ئەمانە لە گفتوگۆکاندا ئامادە دەبن، دیارە دەستنیشانکردنی ئەمانەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ نزیکایەتی لە بەش و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بەرپرسان، نەك توانا و لێهاتوویی.

کاتێك ئامادەی هەندێك لەو گفتوگۆیانە دەبیت، یاخود گوێبیستی هەندێك بابەت دەبیت لەوبارەیەوە، مرۆڤ تووشی سەرسامی دەبێت. دەگێڕنەوە لە گفتوگۆیەکدا کە دوو ئەندامی سەر بە دوو پارتی جیاواز بەشداربوون، یەکێکیان وتوویەتی لەو لاپەڕەیە هیچ زانیاری تێدا نییە و پێویستە لاببرێت، ئەویشیان گووتوویەتی ئەو لاپەڕەیەش بە هەمان شێوە پڕ لە کەموکوڕیی. هەردووکیان مەبەستیان لە ژمارەی ئەو لاپەڕانە، ئەو دوو ساڵە بووە کە هەر یەك لەو دوو پارتە لەگەڵ ڕژێمی پێشووی عێراق ڕێککەوتوون، بەشێوەیەك وەك تانەلێدان بۆ یەکتر بەکاریانهێناوە! بەداخەوە پێشینەی پەیوەندییەکان، میزاجی کەسێتی، ناوچەگەری، پارتایەتی و ئایدۆلۆجیا ڕۆڵی زۆرباش دەبینن لەوبارەیەوە. سەیر لەوەدایە زۆربەی هەرە زۆری هەڵسەنگاندنەکان لە نێوان (زۆرباشە-نایاب)دایە. ئەوەی سەیرە، ماوەی دوورودرێژی گفتوگۆکانە، لەکاتێکدا دەکرێت ژمارەی لاپەڕەکان کەمبکرێتەوە و کاتی گفتوگۆکانیش بەهەمان شێوە.

لە هەڵبژاردنی ئەندامانی لیژنەدا، زۆر بە دەگمەن نەبێت ڕەچاوی پسپۆڕیی





و لێهاتوویی و توانستی زانستی ناکرێت، بەڵکو لە هەندێك شوێن بووە بە سەرە، لەگەڵ ئەمەشدا چەندین مامۆستای لێهاتوو و پسپۆڕی وردی بابەتەکە بەمەبەستەوە پەراوێز دەخرێت و توانستی زانستی لەبەرچاو ناگیرێت. نەك هەر ئەوە، بەڵکو لەم ساڵانەی دواییدا بەشدارییپێکردنی ئەندامانی لیژنەی قۆناغەکانی تری مێژوو تێیدا دەبینرێت، بۆ نموونە پسپۆڕی مێژووی ئیسلامی (سەدەکانی ناوەڕاست) چەندینجار بەشداری گفتوگۆی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای قۆناغی مێژووی کۆن و شوێنەواری کردووە. لەکاتێکدا ئەم ئەندامە بەڕێزە، بە ئەندازەی خوێندکارەکە ڕەنگە کەمتریش شارەزای بابەتەکە نەبێت، نەك هەر ئەوەش بەڵکو پسپۆڕی مێژووی نوێ و هاوچەرخ چووتە نێو بواری هونەرە جوانەکانیشەوە. هەڵبەت پێشتر پسپۆڕی مێژووی نوێ و هاچەرخ بەشداری گفتوگۆی نامەی ماستەری کردووە و سەرۆکی لیژنە بووە لە بواری مێژووی ئیسلامیدا. لە هیچ شوێنێکی تری ئەم دونیایەدا کاری لەو چەشنە نابینرێت.

پسپۆڕیی و بەتایبەتی پسپۆڕیی ورد، پێویستە هەمیشە بەرز بنرخێنرێت. (هەڤاڵ کوێستانی) لە بیرەوەرییەکانیدا، لە شوێنێکدا باس لە ئەندامێکیان دەکات، کە خەفەریاتی نەدەگرت، ڕاپۆرتی پزیشکی هێنابوو تێیدا نووسرابوو چاوی بە دووکەڵ و دەست و پلیشی بە کەف و سابوون هەستیارییان هەیە. هەڤاڵ کوێستانی دەڵێت ڕەتمانکردەوە، چونکە دکتۆر خدر مەعسوم پزیشکی پێست و چاو نەبوو(١٨)! ئەوەتا ئەمە لە شاخ پەسند نەکراوە، ئێمە بۆچی ئەم کارە نازانستییانە ئەنجام بدەین، ڕاژە بە چ بوارێك دەکات؟

وا وێنا دەکرێت ڕۆژگارێك بێتە پێشەوە، دۆخی توێژینەوەی زانستی زۆر لە کاتی ئێستا خراپتر بێت، چونکە تێبینی دەکرێت بەمەبەستەوە کار لەسەر ناشیرینکردنی توێژینەوەی زانستی و بڕوانامە و پسپۆڕی دەکرێت. لەم ماوەیەدا هەندێك مامۆستای میلاك و وانەبێژ، چەند خوێندکارێکی ماستەریان وەرگرتووە بۆ سەرپەرشتیکردنی نامەی ماستەر، لەکاتێکدا هیچیان هەڵگری ناسناوی زانستی پرۆفیسۆری یاریدەدەر نین، بەڵکو ناسناوی زانستی مامۆستایان هەیە، پێیان وتراوە تەنها ڕەزامەندی دوو توێژینەوە بهێنن.

جێگەی خۆشحاڵییە، هەندێك لە مامۆستایانی زانكۆ بۆخۆیان دان بەم واقیعە تاڵ و نالەبارە دەنێن، هەندێكیان باس لەوە دەكەن كە داوایان لێكراوە بەرانبەر بە پڕە پارەیەك نامەی ماستەر و تێزی دكتۆرایان بۆ بنووسرێت، تەنانەت نرخی لاپەڕەكانیشیان دیاریكردووە! مادام ئەم بابەتە لەگەڵ ئەم مامۆستایە كراوەتەوە، كەواتە مامەڵەكە بوونی هەیە، ئەگەر ئەمیش نەیكات كەس و شوێنی تر كارەكەی بۆ بەئەنجام دەگەیەنن. دركاندنی ئەم جۆرە مامەڵەیە، ئەوەمان بۆ پشتڕاست دەكاتەوە، كەوا ئەو خوێندكارانەی بە كۆنمرەی پەنجا و شەستەوە خوێندنیان تەواوكردووە و لە تاقیكردنەوەی توانستی زانستیدا دەرنەچوون و نمرەیەكی زۆر كەمیان هێناوە، هەر ئەوەیان لێ چاوەڕێ دەكرێت. ئاخر تەنانەت وەرزشوانیش پێویستی بە توانا و ڕاهێنان و خۆئامادەكردن هەیە بۆئەوەی بتوانێت لە گۆڕەپاندا یاری بكات. لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستی پشت خوێندنی ماستەر و دكتۆرامان بۆ ڕوون دەبێتەوە، كەوا ئامانج لێی برەودان و قووڵبوونەوە نییە لە پسپۆڕیی و نووسینەوەی توێژینەوەی زانستی.

## تەوەرەی سێیەم:

## دیوی دووەمی توێژینەوە زانستییەكان لەنێو گۆڤار و كۆنفرانسەكاند

بڵاوبوونەوەی توێژینەوەی زانستی لە گۆڤار و كۆنفرانسەكاندا، زیاتر بۆ پلەبەرزكردنەوە و گەیشتنە بە ناسناوی زانستی(١٩)، هەمووشی لەبەرئەوەیە ڕۆژێك زووتر ببێت بە پڕۆفیسۆر. گۆڤاری زانستی وەها هەیە لە كوردستان، هێندە بە سادەیی و ئاسانی بابەت وەردەگرن و بڵاوی دەكەنەوە، زیاتر لە ڕۆژنامەیەكی لۆكاڵی دەچێت تا گۆڤارێكی زانستی سەر بە زانكۆ بێت. گۆڤاری وا هەبووە ساڵی (٢٠٢٣) بڵاویان كردبوویەوە كە هەتاوەكو ساڵی (٢٠٢٥) بەشی توێژینەوەی پەسەندكراویان هەیە بۆ گۆڤارەكەیان. وایلێهاتبوو ئەوەی زۆر پەلەی بووایە، دەیانگووت ئەگەر پەلەتە بینێرە بۆ فڵانە گۆڤار، بە ماوەیەكی زۆر كەم ڕەزامەندی توێژینەوەكەت بۆ دێتەوە. ئەمەش دیسانەوە بەشێكە لە خراپەكاریی و یاریكردن بە گۆڤاری زانستی، ئاستی زانستی و توێژینەوەكان.

هەر لەم چوارچێوەیەدا، زۆرجار بە بەردێك چەند چۆلەکەیەك دەکوژن، بۆ نموونە توێژەر لێکۆڵینەوەیەك دەنێرێت و ناوی سەرپەرشتیار یاخود هاوڕێیەکی خۆی بۆ زیاد دەکات، لەکاتێکدا خۆی بە تەنها توێژینەوەکەی نووسیووە. ئەگەر سەرنجی ئەو توێژینەوانە بدەین، زۆربەی زۆریان بابەتی کرچ و کاڵن، کەمتر هەست بە سەنگ و ئاستی زانستی توێژینەوەیەکی زانستی تێدا دەخوێنرێتەوە. زۆرجاران تەنها ناونیشانەکان گۆڕاون، ئەگەرنا ناوەڕۆکی بابەتەکە پێشتر بڵاوکراوەتەوە. بە واتایەکی تر هیچ تازەگەریی و خستنەڕوویەکی نوێی تێدا نابینرێت. زۆرجار خوێنەر لە یادی دەچێت کە ئەمە توێژینەوەیەکە لەچوارچێوەی قۆناغی مێژووی نوێ و هاوچەرخدایە، چونکە پەلەپروزێ و هەناسەبڕکێیەکی زۆری پێوە دیارە. هەڵبەت زۆر جاران لەسەر داواکاریی و پێداویستی ئەم کارانە ئەنجامدەدرێت، هەربۆیە بە دەگمەن نەبێت، هەست بەوە ناکرێت کە ئەم توێژینەوانە بەرهەمی خوێندنەوە و قووڵبوونەوە و شارەزایی توێژەر بێت لە پسپۆریی ورد و بواری خۆیدا، کە بەمەبەستی ئاشکراکردن و خستنەڕووی بابەتێکی مێژوویی تازە خرابێتەڕوو. ناوەڕۆکی زۆربەیان وا هەست دەکرێت نووسین و دووبارەکردنەوەی زانیارییەکانی پێش خۆیەتی. جێگەی داخە، هیچ جۆرە ڕێگرییەك نییە لەمبارەیەوە، بۆئەوەی هیچ نەبێت توێژەر بتوانێت داڕشتنی خۆی بنووسێت.

لە وڵاتێکی وەکو ڕووسیا، بەرنامەیەك هەیە بە ناوی (ئەنتی پلەگیەت)، واتە دژە دزیکردن و وەرگرتن، لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە توێژینەوەکە پێشکەش دەکرێت، دواتر بە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل هەموو ئەنجامەکەت بۆ دەستنیشان دەکات، بە وردەکاری وشە و دێڕ و کۆپلە و بەشەکانییەوە، کە ڕێژەی بردن و وەرگرتن و بابەتی نوێ تێیدا چەندە؟ ئەمە لە ڕووسیای فیدراڵدا مەرجی سەرەکییە بۆ هەموو توێژینەوەیەکی زانستی لە تەواوی قۆناغە جیاجیاکانی خوێندنی باڵا و بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی زانستی و بەشداریکردن لە کۆنفرانسە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەکانیش. هەر زانکۆ و گۆڤارێك، ڕێژەیەك دادەنێت بۆ توێژینەوەکە، بۆ نموونە مەرج دادەنێن کە دەبێت توێژینەوە زانستییەکان ڕێژەی بنەچەیی واتا تازە و ڕەسەنی چەند بێت و ڕێژەی وەرگرتن و سوودبینین لە سەرچاوە و

گوزارشت و دارشتنەکانی ژێدەرەکانی تر چەند بێت؟ بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی زانستی لە گۆڤاری زانستی و کۆنفرانسەکانی سەر بە زانکۆکان، نزیکەی شەش مانگی دەخایەنێت.

ڕۆژانە ئەگەر بەوردی سەرەنجی هەواڵەکانی هەندێك لە زانکۆکان بدەین، خوێنەر تووشی سەرسوڕمان دەبێت. لە ناوەڕاستی پار ساڵدا، یەکێك لە زانکۆکان هەواڵێکی وەکو چالاکی زانستی زانکۆ بڵاوکردبوویەوە، تێیدا هاتووە: مامۆستایەکی زانکۆمان لە بەشێکی زانستی، لە ماوەی حەوت مانگدا، حەڤدە توێژینەوەی ئیمپاکت فاکتەری بڵاوکردووەتەوە. نازانرێت چۆن لەسەر ئاستی گێتیدا هیچیان لەبارەوە بڵاونەکردەوە؟! چونکە باوەڕ ناکرێت لە هەموو دونیادا هاوتای هەبێت. ڕاستی ئەوەی لەو هەواڵەدا زۆر سەرنجی ڕاکێشام، تەمەنی مامۆستاکە بوو، باشە حەڤدە توێژینەوەی زانستی لە بوارێکی ئاڵۆزی زانستیدا، کە بێگومان بە زمانی ئینگلیزی نووسراوە، دەبێت چەند کاتی بووێت بۆ نووسینەوەی؟ ئەدی هەڵسەنگێنەران و بەرپرسانی گۆڤارەکە؟ ئایا پێشینە و بونیادی زانستی و فەرهەنگیی ئەو مامۆستایە لەو ئاستەدایە؟ چەندین مامۆستای زانکۆ هەیە، لە نزیکەوە ئاگاداری ئەوەین کە توانای ئەوەیان نییە بە زمانی کوردی بابەت بڵاوبکەنەوە، کەچی بە زمانی ئینگلیزیی و عەرەبی توێژینەوە لە دوای توێژینەوە بڵاودەکەنەوە، زانکۆ و بەشیش وەك چالاکی و دەستکەوت لە هەواڵەکانیدا بڵاوی دەکەنەوە.

لە نیشتیمانی ئێمەدا، توێژینەوەی زانستی وەکو داواکاریی و پێویستی ئەنجامدەدرێت بۆ مەبەستێکی تەسکی دیاریکراو، بەبێ سوودوەرگرتن بۆ ناسناوی زانستی، یەك توێژینەوەش بڵاوناکەنەوە. هەربۆیە سەرنجی ئەوە دەدرێت لە پاش وەرگرتنی ناسناوی زانستی، هەتاوەکو لە ژیاندابن یەك وتاریش بڵاوناکەنەوە، هەندێکیشیان هەتاوەکو خانەنشینبوونیش هەر بە پرۆفیسۆری یاریدەدەر ماونەتەوە.

ئەگەر خوێنەر چاوێك بەو توێژینەوانە بخشێنێت، دواجار دیوی تری نەبینراو و قسەلەسەرنەکراو و پەراوێزخراو دەبینێت، یەکێك لەو بابەتە ڕووکشییانەی ئەم توێژینەوانە، بەکارهێنانی سەرچاوەی زۆر و ڕیزکردنی ژێدەری بیانییە وەك

بابەتی ڕووکەش و جوانکاری توێژینەوەکە. ساڵی پار توێژەرێك بابەتێکی زانستی بڵاوکردبوویەوە، لە نزیکەوە ئاگادارم تەنانەت زمانی عەرەبیش بەباشی نازانێت، کەچی چەندین سەرچاوەی ڕووسی، ئینگلیزیی و فەرەنسی بەکارهێنابوو، لە بەشی گۆڤارەکان چووبوو ئەرشیڤی ڕووسی دانابوو! هەرچەندە ئەو ئەرشیڤەش شوێنەکەی دیارە لە کوێ هێنراوە، چونکە پێشتر لە کتێب و سایتیش بڵاوکراوەتەوە. ئاخر زانینی زمان یارمەتیدەرێکی زۆرباشە، بەڵام نەزانین و بەکارهێنانی ماڵوێرانی و کارەساتی زانستی بەدووی خۆیدا دەهێنێت. بابەتی وەها لە کۆنفرانس و گۆڤارە زانستییەکان دەخوێنرێتەوە، ناتوانیت تەنانەت یەك کۆپلەی تازە ببینیت کە زانیاریی و شیکردنەوەی نوێی تێدابێت، کەچی بڵاویش دەکرێتەوە.

## تەوەرەی چوارەم:

## زمان وەك کۆڵەکەیەکی گرنگی توێژینەوەی زانستی

بێگومان توێژەر کاتێك بابەت دەستنیشان دەکات، پێویستە ڕەچاوی زمانزانی خۆی بکات، بۆ نموونە کاتێك زمانی فەرەنسی نازانێت، نابێت توێژینەوەیەك هەڵبژێرێت کە بەشی هەرە زۆری سەرچاوە و ژێدەرەکانی بەو زمانە بێت(٢٠)، چونکە تێگەیشتنی دەقی دۆکیۆمێنتە مێژووییەکان کە بابەتی توێژینەوەی مێژوویی پێکدەهێنن، لەسەر زانینی تەواوی توێژەر دەوەستێ بەو زمانەی پێی تۆمارکراوە(٢١). ڕەنگ بێت زانینی زمان و وەرگێڕان بۆ ئێمەی کورد، لە زۆربەی نەتەوەکانی تر زیاتر پێویست بێت بۆ توێژینەوەی زانستی، لەبەرئەوەی سەرچاوەی پێویست بە زمانی کوردی لەبەردەستدا نییە.

وەکو سەرەنج دەدەین، زانینی زمان و وەرگێڕان وەکو بەشێك لە سەرچاوەکانی توێژینەوەی زانستی، پێگە و سەنگێکی گرنگی پرسەکەیە، دەبێت بە کۆڵەکەی توێژینەوەکە، بەڵام بەداخەوە بەهۆی نەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەی ڕەسەن و نەزانینی زمان، وەرگێڕانیش بووە بە بەشێك لە ئارێشەکانی توێژینەوە مێژووییەکان. خوێنەر کاتێك بەراوردێکی زمانی ڕەسەن و وەرگێڕانەکان دەکات، ئەوجا بۆی دەردەکەوێت کە زانینی زمان و پسپۆڕیی لە بوارەکەدا، چ سەنگ و قورساییەکی دەبێت بۆ پڕۆسەی توێژینەوەی زانستی. بێگومان هەندێك لەو

هەڵە زەقانەی نێو دەقەکان، دەگەڕێتەوە بۆ کاری وەرگێڕان، کە تیاندایە هەر لەناو، ناونیشان، هەتاوەکو ساڵ و مانگیش بە هەڵە وەرگێڕاون. ئەمەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ وەرگێڕی کوردی. کاتی خۆی هەندێك سەرچاوەی باش لە زمانی بیانییەوە وەرگێڕدران بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵێ دیارە پەلەکردن و ناپسپۆڕیی و ناشارەزاییان پێوە دیارە. کە زۆر لەم کتێبە مێژووییانە، بوون بە سەرچاوەی سەرەکی توێژینەوەکان، لەکاتێکدایە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت بەراوردێك بکرێت لە نێوان زمانی ڕەسەن و زمانی وەرگێڕاندا.



**بەداخەوە بەهۆی نەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەی ڕەسەن و نەزانینی زمان، وەرگێڕانیش بووە بە بەشێك لە ئاریشەکانی توێژینەوە مێژووییەکان.**

بەهۆی ئەوەی هیچ پشکنین و پاڵفتەیەك نییە لەمەڕ زمان و وەرگێڕان، دواجار پڕۆفیسۆر و مامۆستای زانکۆ دەبینین، لە بەکارهێنانی زماندا، جیاوازی لە نێوان ڕەگەزی نێر و مێ ناکات. بۆ نموونە: دەڵێین ئەم کتێبە هین ئازادە، واتە ئازاد خاوەنی کتێبەکەیە، ئایا دەکرێت بڵێین، خاوەنی کتێبەکە ناوی (ئازادە) یە؟! پێم سەیرە لە تێزی ماستەر و توێژینەوەکاندا بابەتی سەیر دەخوێندرێتەوە، جارێکیان توێژینەوەیەکم خوێندەوە کە لە لایەن پڕۆفیسۆرێکەوە نووسرابوو، (پیۆتەر ئیڤانەڤیچ لێرخ)-(١٨٢٧-١٨٨٤) کە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسێکی ڕووسە، کەچی لەو توێژینەوەیەدا کرابوو بە ئەڵمانی و ناوەکەشی بەوشێوەیە نووسرابوو (بیترلیتش)! بە دەیان نموونەی لەو چەشنەمان لەبەردەستدایە، ئەمە ئەوەمان پێدەڵێت کە ئەم توێژینەوانە بەوردی لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە هەڵناسەنگێنرێن و ناخوێندرێنەوە.

لە وڵاتانی دەرەوە، وەرگێڕان وەکو هەر بوارێکی تری کایەی زانستی و فەرهەنگی، پێگە و قورسایی خۆی هەیە، کە دەبێت لەچوارچێوەی یاسا و ڕێنماییەکاندا بێت. دەکرێت لێرەدا چەند نموونەیەك بهێنینەوە بۆئەوەی زیاتر مەبەستەکەمان ڕوون بێتەوە. جێگەی باسە، خوێنەر کاتێك کتێبەکەی (ڤ.ف. مینۆرسکیی)-(١٨٧٧-١٩٦٦) بە زمانی کوردی دەخوێنێتەوە(٢٢) و بەراوردی دەکات لەگەڵ سەرچاوە ڕووسییەکە کە لە ساڵی ١٩١٥ چاپکراوە(٢٣)، لە هەندێك شوێن باوەڕ ناکرێ هەمان نووسراو بێت. زۆر دوور نەڕۆین، تەنانەت ڕوانشاد پ.د. مارف خەزنەدار بۆخۆیشی دانی بەوەناوە کە وەرگێڕانە کوردییەکە کەموکورتی تێدایە. هەربۆیە داوا دەکات بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی زانستی، پێویستە چاپی ڕووسی یاخود عەرەبییەکە سەرچاوەی بنچینەیی بێت(٢٤).

کتێبەکەی (پ.ی. ئەڤێریانۆڤ) کە لە ساڵی ١٩٠٠ بڵاوکراوەتەوە(٢٥)، یەکێکە لە سەرچاوە هەرە نایابەکان، بەڵام کاتێك کتێبەکە بە زمانی کوردی دەخوێنیتەوە، دیسانەوە خۆێنەر تووشی بابەتی سەرنجڕاکێش دەکات(٢٦). هیچ گومان لەوەدا نییە، کە ڕەوانشاد د.ئەفراسیاو هەورامی ڕووسیزانێکی زۆرباش بوو، بەڵام ئەوەی سەرنج دەدرێت بەتایبەتی لەم کتێبەدا، هیچ جۆرە شارەزاییەك لە زمانی کوردیدا بەدی ناکرێت. بە لای ئێمەوە پێویستە ئەم کتێبانە پێداچوونەوەی زانستییان بۆ بکرێت، یاخود جارێکی تر لە لایەن کەسانی شارەزا و پسپۆڕەوە وەربگێڕدرێنەوە.

سێ ساڵێك پێش ئێستا، لە یەکێك لە گۆڤارە کوردییەکان، بابەتێکی کوردناسیی ڕووس خاتوو (ئەنجێلیکا) لە زمانی ڕووسییەوە وەرگێڕدرابووە سەر زمانی عەرەبی(٢٧)، ئیدی منیش پەیوەندیم پێوەکرد و گۆڤارەکەشم بۆ نارد. چەند ڕۆژێك لە پەیوەندیدا بووم لەگەڵی و گفتوگۆی ئەوەی لەگەڵ دەکردم، کەوا چۆن بەبێ پرسی خۆی بابەتەکەی وەردەگێڕن؟ ئەوەی کە زۆر نیگەرانی کردبوو، بە هەڵە نووسینی پاشناو یاخود ناسناوی خێزان و بنەماڵەکەیان بوو، ئیدی منیش ناچاربووم پەیوەندی بە بەرپرسانی ئەو گۆڤارەوە بکەم، هەربۆیە داوای لێبوردنیان کرد، بەڵام خاتوو ئەنجێلیکا چاوەڕێی نووسراوی فەرمی بوو! ناهەقی نییە، چونکە ئەو لە ژینگە و یاسا و ڕێسای خۆیەوە دەڕوانێتە کوردستان، گومان

لەوەدا نییە ئەمە بۆ زمانەکانی تریش هەر ڕاستە.

کاتێك سەرنجی هەندێك سەرچاوەی وەرگێڕدراو دەدەین بە زمانی کوردی و عەرەبی، جگە لە کەموکورتی لە وەرگێڕاندا، بەڵکو زۆر کۆپلە و بابەت و بڕگە هەن، هەر بڕاوە و قرتێندراوە. دەبێت سوپاسی خودا بکەین کە خاوەنەکانیان کوردی و عەرەبی نازانن و لە ژیانیش نەماون. لەم چەند ساڵانەی دواییدا چەندین کتێب لە زمانی ڕووسییەوە وەرگێڕدراون بۆ کوردی، بەداخەوە لە لایەن کەسانی ناپسپۆڕ و ناشارەزا وەرگێڕدراون، بۆیە لێوانلێون لە هەڵەی زانستی گەورە، چونکە لە نزیکەوە ئاگاداری کارەکانیانین. تێیاندا هەیە پارەیەکی زۆر دراوە بە وەرگێڕ و ئەوەی پێداچوونەوەی بۆ کردووە، لە کۆتاییشدا پڕۆژەکە شکستهێناوە، لەکاتێکدا بەندە لە سەرەتاوە پێم ڕاگەیاندن کە دەستهەڵگرتن لەو کارە خزمەتی زیاتر دەکات هەتا بەردەوامبوون. ئاشکراشە جگەلە پاڵنەری ئابووری و ناوپەیداکردنی ڕووکەشی، هیچ کەس ناچار نەکراوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرە. بەداخەوە ئەم سەرچاوانە لە توێژینەوە زانستییەکان بەکاردەهێنرێت.

کارەسات لێرەوە دەستپێدەکات، چونکە بوون بە پڕۆفیسۆری یاریدەدەر و پڕۆفیسۆر لە ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانەیە. مارف خەزنەدار لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: پڕۆفیسۆرمان لێ هەڵکەوتووە لە زانستگا، لە زمانی قسەکردنەکەی خۆی بەولاوە هی دیکە نازانێ!(٢٨) ناهەقی نەبووە وەهای گووتووە، چونکە ئەو لیژنەیەی بۆ پێدانی پلەی پڕۆفیسۆری نێوبراو دەستنیشانیان کردبوو، بریتی بوو لە ئەکادیمیا و زانستگا و دەسگا زانستییەکانی بەریتانیا، ئەڵمانیا، ئەمریکا و ڕووسیا(٢٩).

بەپێی خوێندنەوەمان بۆ توێژینەوە مێژووییەکانی قۆناغی نوێ و هاوچەرخ، دەتوانین بڵێین جارێ لە پڕۆسەی نووسینەوەی مێژوو و توێژینەوەی زانستیداین، هێشتا لە قۆناغی گواستنەوەی زانیارییەکانداین بە کەموکوڕییەکانییەوە، هەربۆیە هێشتا زووە قسە لەمەڕ بابەتگەلێکی وەکو ڕەخنەی مێژوویی، فەلسەفەی مێژوو و لێکدانەوە بۆ پشت ڕووداوەکان بکەین. بەڕاستی مرۆڤی بوێری دەوێت لەم بارودۆخەدا بتوانێت هیوایەك لەمەڕ توێژینەوەی زانستی هەڵبچنێت، بریا توانیبامان چەند خاڵێك دەستنیشان بکەین وەکو پێشنیاز.

## تەوەرەی پێنجەم:

## هۆکارەکانی پشت گرفتی توێژینەوەی زانستی

بێگومان ئەمماڵوێرانیی و پاشاگەردانییەی لە بواری توێژینەوەی زانستی لە زانکۆکانی کوردستاندا ئامادەیی هەیە، بە ڕۆژێك و دووان وەکو قارچك هەڵنەتۆقیووە، بەڵکو سگپڕە بە کۆمەڵێك پاڵنەر و پێشینەی نازانستی لەمێژینەی زانکۆکان، ئەمەی لە ئێستادا هەستی پێ دەکرێت، سەرەتای ئەنجامی ئەو کارە نایاسایی و نازانستییەیە کە کاتی خۆی چەند بەش و زانکۆیەك بەرهەمیانهێناوە. هەوڵدەدەین لێرەدا زۆر بە کورتی و خێرایی دەست بخەینە سەر هۆکارە سەرەکییەکانی ئارێشەکانی دۆخی ئێستای توێژینەوە زانستییەکان. بەبێ گەڕانەوەمان بۆ ڕابردوو، ئاسان نییە بتوانین لە بارودۆخی هەنووکە تێبگەین.

جێگای باسی، پاش ڕاپەڕین و پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، لە سەرەتاوە زانکۆ تاڕادەیەکی زۆرباش پێگە و ئاستی خۆی لە دەست نەدابوو، چونکە هەر لەسەر ڕێڕەوی پێشوو دەچوون. لەمبارەیەوە چەندین نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای ئاست بەرز لە بواری مێژووی نوێ و هاوچەرخدا هاتە بەرهەم، هەندێکیان دواتر لە شێوەی کتێب چاپ و بڵاوکرانەوە، کە هەتاوەکو ئێستا نرخ و بەهایان وەکو خۆی ماوەتەوە.

بەداخەوە لە سەردەمی شەڕی نێوخۆدا، زانکۆکانی کوردستان بەتەواوەتی کەوتنە ژێر هەژموون و دەسەڵاتی حیزبەوە. ئیدی لەوکاتەوە بە دەیان و سەدان کەس لە قۆناغی بەکالۆریۆس و ماستەر و دکتۆرا لە ڕێگەی حیزبەوە وەردەگیران، کە زۆربەی هەرە زۆریان لە دەرەوەی ڕێنمایی و مەرجە زانستییەکان بوون. کاریگەری پارتایەتی و ئایدۆلۆجی بەڕوونی لە هەندێك لە نامەی ماستەر و تێزی دکتۆراکانی ئەوکاتە دیارە. هەر دەڤەر و ناوچەیەك لەمەڕ مێژووی ڕامیاریی و ئایدۆلۆجی پارتەکەی خۆی دەینووسی و هەر بۆخۆشیان تاوتوێیان دەکرد. دەکرێت ئەمە بە سەرەتای ئارێشەکانی توێژینەوەی زانستی ناوەزەند بکەین لە کوردستان، کە بەداخەوە بە هۆی کاریگەرییەکانی شەڕی نێوخۆوە، نەتوانرا سەرەتا و نموونەیەکی زانستی و بێلایەن لە زانکۆکاندا نیشان بدرێت، بەڵکو کاریگەرییەکانی ململانێ ڕامیارییەکان، بوو بەهۆی سەرەتایەکی نازانستی،

ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەستی پێدەکەین، درێژکراوەی ئەو قۆناغە مێژووییە نالەبارەی خوێندنی باڵایە بە هەموو بەشەکانییەوە.

لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، هیچ خوێندکارێکی ئیسلامی یاخود ڕدێندار نەیدەتوانی لە زانکۆ وەربگیرێت بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا، تەنانەت ئەگەر یەکەمی سەر بەش و زانکۆش بووبێت، چەندین خوێندکار بوونە قوربانی ئەم بیرە ئایدۆلۆجیی و پارتایەتییەی نێو زانکۆ، لەکاتێکدا ئەو خوێندکارانە لە هەموو قۆناغ و بەش و پسپۆڕییەکدا، نموونە ڕەوشت و توانستی زانستی بوون.

لە ساڵانی پاش ٢٠١٠ وە دەکرێت بە قۆناغێکی نوێی توێژینەوەی زانستی ناوزەند بکەین، لەم قۆناغەدا بە لێشاو خەڵك لە ماستەر و دکتۆرا وەردەگیران، چونکە یەکەم هەنوی خوێندنی باڵا و زانکۆکان، دابەزاندنی توانستی زانستی بوو. هەروەها ئاسانکاری کرا لە مەرج و ڕێنماییە زانستییەکان بۆ وەرگرتنی خوێندکار لە خوێندنی باڵا، بۆ نموونە مۆڵەتی خوێندن بۆ دەرەوە، توانستی زمانی ئینگلیزیی و کۆمپیوتەر، ئا لێرەوە کارەسات و ماڵوێرانییە گەورەکە دەستیپێکرد، پێموایە لە هیچ کاتێکدا بڕوانامە بەو چەشنە بێ نرخ و بێ بەها نەکراوە. بەداخەوە کەسانی نەشارەزا و بێ پلان ئەم دۆخەیان هێنایە ئاراوە.

یەکێك لەو ئاسانکارییانە، نمرەی بەکالۆریۆس کەمکرایەوە، کاتی خۆی کۆمەڵێك مەرجی زانستی و ڕێنمایی یاسایی هەبوو بۆ وەرگرتن، بۆ نموونە ئەوەی پەیوەستە بە پێشینەی زانستی و توانستی خوێندکارەوە. بۆ وێنە دەبوو خوێندکار کۆنمرەی حەفتا کەمتر نەبێت، یان لە دە یەکەمەکانی بەشەکەی خۆی بێت، یاخود لە چارەکی یەکەمی ڕیزبەندی بەشەکەی بێت و دەرچووی خوولی یەکەم بێت. دواتر و پاش دەرچوون لە توانستی زانستی، خوێندکار چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکرا، ئەمە لە دەرەوەی وڵاتیش هەتاوەکو ئێستا بوونی هەیە.

بەڕاستی ئەم مەرج و ڕێنماییە زانستی و یاساییانە بەربەستێکی زۆرباش بوون بۆ هێشتنەوەی بەهای بڕوانامە و توێژینەوەی زانستی. چونکی بەخشینی بڕوانامە، فرۆشتنی کەلوپەل و پێداویستی ناوماڵ نییە، بەڵکو بەرپرسیارییەتییەکی گەورەیە، هەربۆیە پێویستە لەسەر بنەمای توانا و لێهاتوویی بێت لە بوار و پسپۆڕییەکی دیاریکراودا. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەوەی لێ دەخوێندرایەوە

کە هەڵگری بڕوانامەی بەرز و بوون بە مامۆستای زانکۆ، بۆ هەموو کەسێك نییە. جێی داخە دواتر وایلێهات خوێندکار بە کۆنمرەی پەنجا و شەستەوە لە ماوەیەکی کەمدا، ماستەر و دکتۆرایان تەواو دەکرد و ڕاستەوخۆ ڕاژەکەیان دەگواستەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا، پاشان ناسناوی زانستیان وەردەگرت و دەبوون بە مامۆستای زانکۆ. لەکاتێکدا ئەگەر سەیری ئاستی قۆناغی بەکالۆریۆسیان بکەیت زۆر لاوازن، تیایاندا هەیە لەو قۆناغەدا لە چەندین بابەت کەوتووەتە خوولی دووەم، یاخود بە پەڕینەوە دەرچووە. کەمکردنەوەی کۆنمرەی بەکالۆریۆس و پێدانی مۆڵەت بۆ دەرەوەی وڵات، یەکێك بوو لەو کارەساتانەی کە چارەسەر ناکرێت.

وایلێهاتبوو هەریەکێك بۆخۆی سەربەخۆ دەچووە یەکێك لەو وڵاتە عەرببیانە و بڕوانامەیەکی قەبەیان دەهێنایەوە، لەکاتێکدا زۆربەی زۆریان عەرەببیان نەدەزانی، نە ئەوەش بوو لەوێ کۆرسی زمانی عەرەبی بخوێنن، هەڵبەت ئەمە بۆ تورکیا و ئێران و وڵاتانی تریش تاڕادەیەك ڕاستە. چەندین خوێندکار دەناسم، بە کۆنمرەی پەنجا و شەست و خوولی دووەم و پەڕینەوە قۆناغی بەکالۆریۆسی تەواوکردووە، کەچی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە پلەی نایاب ماستەری بە زمانی ئینگلیزی تەواو دەکرد و یەکسانکردنی بڕوانامەشی بۆ دەکرا. نهێنیی و ڕەهەندەکانی پشت ئەم بازدان و گەشەکردنە ناسرووشتییە بۆ خوێنەری هێژای بەجێدەهێڵم.

یەکێك لە ئارێشە هەرە گەورەکانی بەردەم دواکەوتنی توێژینەوەی زانستی لە زانکۆکاندا، حیزبیبوونە، بەداخەوە زۆربەی زۆری مامۆستایان سەر بە پارتێکی دیاریکراون، ئەوەشی خۆی لەو پارتایەتییە بەدوور بگرێت، بێگومان لە هەموو شتێك پەراوێز دەخرێت، هەرچەند بە توانا و لێهاتوویش بێت. ئەم ڕۆژگارانە هەمووی تێدەپەڕن، ئەوەی دەمێنێتەوە ڕاستگۆیی و توانا و لێهاتوویی مرۆڤە نەك بابەتی تر.

پاشان من تێناگەم، یەکێك لە خەسڵەت و مەرجەکانی بوون بە توێژەر، دادوەریی و بێلایەنییە، کە پێویستە توێژەر خۆی لە هەواداری کەسیی و ئارەزووە تایبەتەکان، بەرژەوەندییە تایبەتییەکان خۆی بپارێزێت، لەهەمانکاتدا

پێویستە خۆی لە پەیوەندی خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان، پاڵنەرە ئایدۆلۆجیی و حیزبییەکان بە دوور بگرێت(٣٠). کەچی ڕۆژانە وێنەی مامۆستایان لەنێو چالاکییەکانی پارتەکەیاندا دەبینرێت، یاخود بانگەشە بۆ سەرخستنی لیستی پارتەکەیان دەکەن. ئایا دەکرێت لەم ڕێگەیەوە پەرە بە توێژینەوەی مێژوویی بێلایەن بدرێت؟

بە چەشنێك ڕێگا خۆشکرابوو، کەسی گەورە و بەتەمەن بە نمرەیەکی کەمەوە دەهاتن بۆ خوێندنی ماستەر، هەندێکیان بەهۆی تەمەن و خانەنشینبوونیانەوە فریای دکتۆرا نەدەکەوتن، هەندێکیشیان پاش ماوەیەکی کەم لە وەرگرتنی بڕوانامەکە خانەشین دەبوون. هۆکاری ئەمەش، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە مەرجی تەمەنیان هەڵگرتبوو، چونکە لەبری ئەوە پارە دەدرا. باشە بەرپرس و پلاندانەری ئەم وەزارەتە بیریان لەوە نەکردووەتەوە، جگەلەوەی بڕوانامە بێ بەها دەکرێت، ئایا سوود لەم کەسە بە تەمەنە وەردەگیرێت؟ لەهەمانکاتدا پارەیەکی باشیش دەچێتە سەر مووچەکەی بێ ئەوەی بتوانێت سوود بە نیشتیمان و دەوروبەری خۆی بگەیێنێت. ئەو هەموو ساڵە بۆچی نەیتوانیوە بخوێنێت؟

لە کۆی ئەو هەموو ماستەر و دکتۆرایانەی سەرەنجمداوە، هیچیان وەکو دوو پسپۆڕی بواری مێژوو، واتە لە نێوان (مێژووی ئیسلامی و مێژووی نوێ و هاوچەرخدا) سەرنجیان ڕانەکێشاوم! یادیان بەخێر ئێستا لە دەرەوەی زانکۆ سەرقاڵی ژیانی تایبەتی خۆیانن، ئەم دوو دکتۆرە بەڕێزە ماستەرەکەیان لە پسپۆڕی مێژووی ئیسلامییە، بەڵام دکتۆراکەیان لە بواری مێژووی نوێ و هاوچەرخدایە. ئەوەندەی من ئاگادارم، لەلایەن ئەکادیمییەکی عەرەبەوە ئەم باسە وروووژێنراوە. دیارە ئەم بابەتە هەتاوەکو هەنووکە بوونی هەیە، باوەڕ ناکرێت لە هیچ شوێنێکی تر ئەم کارە ببینرێت!

لەم چەند ساڵەی دواییدا و بەتایبەتی لە پار ساڵدا، بڕوانامە و خوێندنی ماستەر و دکتۆرا بە چەشنێك بوو بە گاڵتەرجاڕی، کە هەتاوەکو چەند نەوەی تر ناتوانرێت ئەمە ڕاستبکرێتەوە. لە دەرەوەی ڕێنمایی و مەرجی وەرگرتن، بە دەیان و سەدان خوێندکار وەرگیران. بەشی وا هەیە هێندەی ژمارەی قۆناغی بەکالۆریۆس خوێندکاری وەرگرتووە. زۆریان لە تاقیکردنەوەی توانستی زانستی

نەك هەر دەرنەچوون، بەڵكو نمرەیەكی زۆر كەمیان هێناوە، كەچی دواتر هەموویان وەرگیران. خوێندكارێك لە پسپۆڕی خۆی دەرنەچێت و نمرەیەكی كەم بهێنێت، كەچی وازی لێنەهێنیت هەر لەبەرئەوەی پارە دەدات، بیخەیتە نێو پرۆسەی بەماستەربوون و بەدكتۆرابوون! دەبێ چاوەڕێی چی لێبكرێت، خۆشبەختانە هەموو نمرەكان ئاشكرا كران. ئەم هەنگاوە ئەنجام و داهاتوویەكی زۆر لەمە خراپتری لێ چاوەڕوان دەكرێت.

جێگەی باسە، ئەو كورتە باسە و خستنەڕووی ئەو چەند نموونەیە، تەنها بۆ ڕوونكردنەوە و بەرچاوڕوونی بوو، ئەگەرنا بە سەدان نموونەی زیندوو لە بەردەستدان. ئەگەر ئەمە دیو و گۆشەنیگایەكی تری دۆخی توێژینەوەی زانستی بێت كە بە بنچینە و كۆڵەكەی سەرەكی خوێندنی باڵا و زانكۆ هەژمار دەكرێت، ئایا دەتوانین بڵێین، پێگە و قورسایی ئەم توێژینەوانە، توانای ئەوەیان هەیە كاریگەری لەسەر كۆمەڵگە دروستبكەن؟ بە واتایەكی تر دەكرێت بپرسین: بۆچی هیچ جۆرە كاریگەری و پێشكەوتنێك لە ڕێگەی ئەو توێژینەوانەوە نابینرێت؟ بێگومان توێژینەوەكان توانا و وزەی كاریگەرییان نییە، چونكە زۆرینەیان هەر بە مردوویی لەدایكبوون.

زانكۆ و كادیرەكانی زانكۆش بە هەمان چەشن، بە حوكمی ئەوەی زۆرینەیان لە ڕێگەی پارتایەتییەوە هاتوون، یاخود لەژێر فشار و هەژموونی پارتێكدان، توانای بەرگریكردنیان بەرانبەر بە هەموو پرسەكان مردووە. ئێوە سەرنج بدەن، هەر لە نەوەدەكانی سەدەی ڕابردووەوە بەتایبەتی لە شەڕی ناوخۆوە هەتاوەكوو قەیرانەكانی ئەمڕۆمان، زانكۆ و مامۆستایانی زانكۆ توانیویانە چ ڕۆڵێك بگێڕن لەوبارەیەوە؟ لەڕاستیدا گوتاری مامۆستایانی زانكۆ لە ئاست ئارێشەكانی كۆمەڵگەدا تەواو بێدەنگكراوە. بێگومان بەخشینی بڕوانامە و شوێنی گەورە بە كەسی نەشیاو، وا لەو مرۆڤە دەكات توانا و وزەی بەرگریكردنی نەمێنێت و بە چاوێكی كزەوە بڕوانێتە بابەت و ڕووداو و پێشهاتەكان. (ئێنێن ئەكرەم) لە وتارێكیدا لەمەڕ پرسی ڕۆشنبیر، باس لەوە دەكات لە توركیا زۆر لە پرۆفیسۆرەكانی زانكۆ بە ئاشكرا نكۆڵی لە بوونی كورد دەكەن و هەڵسەنگاندنێكی ناڕاست بۆ زۆربەی ڕووداوەكان دەكەن كە لەو وڵاتەدا ڕوودەدەن، ئەگەرچی ئەمانە خەڵكانێكی

پلە بەرزن، بەڵام ناتوانرێت پێیان بوترێت ڕۆشنبیر(٣١). زۆر بەداخەوە، زانکۆ نەك هەر نەیتوانیوە قسە و گوتاری هەبێت لەمەڕ پرسە گرنگەکانی کۆمەڵگە، بەڵکو زۆرجار ئارێشە و کێشەکانی نێوخۆی خۆشی دەباتە دەرەوە و لە ڕێگەی ئاشتەوایی عەشایەریی و خێڵ و بنەماڵەوە چارەسەر دەکات! ئەگەر کێشەیەکی نێوخۆیی تایبەت بە زانکۆ، بەسەر خودی زانکۆ و دادگا باز بدات و پەنا بەرێتە بەر مێنتەڵێتی خێڵ، ئایا ئەمە کارەسات و مەرگی زانکۆ نییە؟!

ئێوە بڕوانن، ڕۆژانە و مانگانە و ساڵانە بە دەیان و سەدان ڕووداوی مێژوویی گەورە لەسەر ئاستی دونیا و ناوچەکەدا ڕوودەدات، بەمەبەستەوە ئاوڕی لێنادرێتەوە، بەڵام شتێکی بچووکی حیزبی و ناوچەگەریی و ئایدۆلۆجی دەبینرێت، هەمووان بۆچوونی خۆیان لەبارەوە دەنووسن. بۆیە زۆربەیان وا دەخوازن زیاتر وەکو توێژەر و مێژوونووسی نێوچەیی و خێڵەکیی و ئایدۆلۆجی خۆیان نیشان بدەن. قۆناغی شەڕی ناوخۆ، ڕووداوێکی مێژوویی دیارە، چونکە کاریگەرییەکی فرە ڕەهەندی بەدووی خۆیدا دروست کرد، هەتاوەکو ئێستا چ توێژینەوە و نووسینێکی مێژوویی بێلایەن لەوبارەیەوە بڵاوکراوەتەوە؟ کە وەکو قۆناغێکی کاریگەر لە مێژوومان بنووسرێتەوە بەمەبەستی دووبارەنەبوونەوەی ئەو کارەساتە. لەڕاستیدا مێژوونووسی بێلایەن، نابێت لە پرسێکی گرنگی وەهادا خۆی بدزێتەوە و ئەم پرسە گرنگە بشارێتەوە، ئەگەرنا ئەو کات ئەوی تر و بێگانەکان لەبارەیەوە دەنووسن(٣٢).

لە کۆتاییدا ئەم چەند وردە سەرنجەمان ئاڕاستەی بەرپرسانی خوێندنی باڵا دەکەین، چونکە ئاشکرایە مێنتەڵێتی خێڵ لە پشت ئەم بەرنامە شکستخواردووەوەیە. سەرباری ئەوەش، وەکو لە نزیکەوە ئاگادارین، چەندین مامۆستای لێهاتوو و بەتوانا و کارامەمان هەن، کە دەکرێت لەسەر ئاستی دەرەوەش شانازییان پێوە بکەین، بەڵام بەداخەوە هەمووان بوون بە قوربانی ئەم سیستەمە خراپەی خوێندنی باڵا.

# پەراوێز و ژێدەرەکان

١-قادر محەمەد پشدەری: زانکۆ و توێژینەوەی زانستی، گ(ئەکادیمیای کوردی)، ژ(٨)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٦٢-٦٣.

٢-ئامانج نازم بیجان: ئەفسانەی لێکۆڵینەوەی زانستی لە زانکۆدا، لە کتێبی: گروگاڵی نووسین، سلێمانی، ٢٠٢٣، ل٦٤.

٣-تەلاڵ مەجزووب: ڕێبازی لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریی و پراکتیکی، و: مەریوان عەبدول، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٧.

٤-حسان حلاق: مناهج الفكر والبحث التاريخى والعلوم المساعده وتحقيق المخطوطات مع دراسة للارشيف العثمانى واللبنانى والعربى والدولى، بيروت، ٢٠٠٤، ص١٦٩.

٥-بۆ زانیاری پتر لەمبارەیەوە دەڕوانرێتە: توانا ڕەشید کریم: ئاڕاستەی نووسینیی مێژوویی لە ماستەرنامە و تێزەکانی دکتۆرای مێژووی نوێ و هاوچەرخ (بەشی مێژووی زانکۆی سەلاحەدین وەك نموونە)، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، Vo1.5، No.3 (July، 2018، ل233.

٦-ريكان ابراهيم: علم النفس والتاريخ، بغداد، (١٩٨٨)، ص١٢٦.

٧-سەعدی عوسمان هەرووتی: ڕێبازی نووسینەوەی مێژوو لە هەرێمی کوردستاندا (خوێندنەوەیەك بۆ نامە زانکۆییەکانی دوای ڕاپەڕین)، گ(ژین)، ژ(٦)، دیسەمبەری ٢٠١٤، ل١٣٦-١٣٧.

٨-دعاو محمد قاسم: الكهرباو فى العراق حتى العام (١٩٦٨)-دراسه تاريخية، رسالة ماجستير غير منشورة، الجامعة المستنصرية، (٢٠١٦).

٩-باسم محمد سلمان الشمرى: أحمد راضى-دراسه فى سيرتة الرياضية واثره الاجتماعى والبرلمانى (١٩٦٤-٢٠٢٠)، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة المثنى، (٢٠٢٣).

١٠-ئازاد عەبدولواحید (هەڤپەیڤین): پ.د. موحسین محەمەد حوسێن بێ ترس و دوور لە سۆز مێژوو دەنووسێتەوە، هەولێر، (٢٠١٩)، ل ل١٨٨-١٨٩.

١١-ايات أحمد عبدالوهاب النعيمى: جامعه السليمانية (١٩٦٨-١٩٩٢) دراسه تاريخية، رسالة ماجستير غير منشورة، الجامعه المستنصريه، (٢٠٢٣)

١٢-حسن ضارى سبع الدليمى: منهج الكتابة التاريخية عند كمال مظهر أحمد، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بابل، (٢٠٠٦).

١٣-أثير كاظم عبد زيد الخالدى: المؤرخ محسن محمد حسين وجهوده الفكرية-دراسه تاريخية، مراجعة وتقديم: أحمد ناجى، النجف الاشرف، ٢٠١٨.

١٤-راهى مزهر العامرى: مسعود محمد ودوره السياسى فى العراق (١٩١٩-١٩٨٦)-دراسه تاريخية، مراجعة وتقديم: كمال مظهر احمد، بغداد، ٢٠٠٨.

١٥-أحمد على سبع الربيعى: مكرم الطالبانى ودوره السياسى والفكرى فى العراق (١٩٢٣-١٩٧٩)، مراجعة وتقديم: أسامه عبدالرحمن الدورى، بغداد، (٢٠١٨).

١٦-محەمەد عەبدوڵڵا کاکە سوور: گرفتەکانی نووسینی مێژووی کورد، گ(مێژوو)، ژ(٩)، زستانی ٢٠٠٩، ل٣٤٤.

17-Тяжелое время дл курдов. Новый Курдистан. № 2. Санкт-Петербург. 1-июля. 1997 г. С.2

١٨-هەڤاڵ کوێستانی: ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، سلێمانی، ٢٠١٧، ل٨٩.

١٩-قادر محەمەد پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

٢٠-سامان حوسێن ئەحمەد: میتۆد و لێکۆڵینەوە-هەنگاوەکانی نووسینی لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، تاران، ٢٠٢٠، ل١٨٨.

٢١-طه باقر، عبدالعزيز حميد: طرق البحث العلمى فى التاريخ والاثار، جامعة الموصل، ١٩٨٠، ص١٢٩.

٢٢-مینۆرسکی: کورد-تێبینی و وردبوونەوە، و: حەمەسەعید حەمەکریم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٣.

23-Минорский В.Ф. Курды. Заметки и впечатления. Петроград(1915)

٢٤-مارف خەزنەدار: دیجلەی هزرم، ب١، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٧٨.

25- Аверьянов П.И. Курды в войнах России с Персией и Турцией в течение XIX столетия. Современное политическое положение турецких، персидских и русских курдов. Исторический очерк. Тифлис. 1900.

٢٦-پ.ی. ئەڤیریانۆڤ: کورد لە جەنگی ڕوسیا لەگەڵ ئێران و تورکیادا-بارودۆخی سیاسی ی کوردی تورکیا و ئێران و ڕوسیا، و: ئەفراسیاو هەورامی، سلێمانی، (٢٠٠٤).

27-Победоносцева А. О. Курды в Русских периодических изданиях XIX в. Вестник СПбГУ. Сер. 13، вып. 3، 2010

٢٨-ئازاد عەبدولواحید (هەڤپەیڤین): د. مارف خەزنەدار-ئەزموونێکی تایبەتی لە ڕۆژگارێکی نووسیندا، هەولێر، (٢٠١١)، ل٩٠.

٢٩-مارف خەزنەدار: ڕۆژگاری من، بەرگی شەشەم، هەولێر، ٢٠١١، ل١٢٩.

٣٠-سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر: ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، سلێمانی، ٢٠١٩، ل٤٦-٤٧.

31-Енен ЭКРЕМ. Интеллигенция: авангард и совесть нации. Новый Курдистан. № 14. Санкт-Петербург. сентябрь. 1998 г. С.6

٣٢-بۆ نموونە لەمبارەیەوە بڕوانە: وسن سعید عبود، نبیل العلوی: الصراع المسلح بین الحزبین الدیمقراطی الکردستانی والاتحاد الوطنی الکردستانی (١٩٩٤-١٩٩٨) والموقف الدولی منه، العدد الرابع والعشرون، مجله کلیة التربیه للبنات، جامعة البصرة، حزیران ٢٠١٨، ص٢٢٥-٢٦٦.



**کازم ئەحمەد سەدرەدین**
ماستەر لە جوگرافیا

# ڕەهەندەکانی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستیدا

## پێشەکی

هەموو توێژینەوەیەك پشت بە کۆمەڵێك خاسیەت و تایبەتمەندی زانستی دەبەستێت، لە پاڵ بابەتی بوون و گشتگیریی و پێشبینیکردن و وردی لە ئەنجامەکان، ڕاستییەتی و باوەڕپێکراویش بەیەکێك لە خاسیەتە گرنگەکانی توێژینەوەی زانستی دادەنرێت، کاردەتە سەر ڕادەی کوالێتی و متمانەدارکردنی توێژینەوەکە و ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە هەڵسەنگاندنی لایەنی زانستی و گەیشتن بە ئاستێکی بەرزی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، چونکە هەموو توێژەرێك بۆئەوەی توێژینەکەی باوەڕپێکراو بێت و بەشدار بێت لە دروستکردنی بڕیاردا، دەبێت ڕاستییەتی باوەڕپێکراوی تێدا ڕەنگبداتەوە.

هیچ توێژینەوەیەك ناگات بە ئاستی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی هەتاوەکو (وردی، ڕاستی و دروستی، ڕاستگۆیی هزریی، دورکەوتنەوە لە دەمارگیری و حەزوئارەزوی تاکەکەسی، هەروەها بێلایەنی، بوونی بەڵگەی پێویست بۆ گەیشتن بە ئەنجام و بڕیاردان) تێدابەرجەستە نەبێت، گرنگە توێژەران وردبن لەو داتا و زانیارییانەی لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانەوە وەری دەگرن، پێش بەکارهێنانیان شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن بۆ ئەوەی دووربن لە هەڵە و کەموکوڕی و بێ متمانەیی.

بۆ ناسین و گەیشتن بە چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی و ئەنجامێکی دورست، پلانی پەیپەرەکەمان دابەشکردووە بۆ سێ بەش، لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە داوە لەڕووی (گرنگی لێکۆڵینەوە، ئامانجی لیکۆڵینەوە، گرفتی لێکۆڵینەوە، گریمانەی لێکۆڵینەوە، میتۆدی لیکۆڵینەوە، پلانی لێکۆڵینەوە).

بەشی دووەممان بەسەر سێ باسدا دابەشکردووە، لە باسی یەکەمدا توێژینەوەی زانستی و باسی دووەم ١:١چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستی، ١:٢ چەمکی ڕاستییەتی، ١:٣ چەمکی باوەڕپێکراوی، ١:٤ پەیوەندی نێوان ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، باسی سێیەم ٢:١ چۆن گرنتی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی بکەین لە توێژینەوەی زانستیدا؟ ٢:٢ چۆن ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەدا بنووسین؟. پاشان کۆتایی (پەیپەر)ەکەمان، بە ئەنجامەکان و ڕاسپاردەکان و لیستی سەرچاوەکان کۆتایی پێهێناوە.

## بەشی یەکەم: چوارچێوەی توێژینەوە

گرنگی توێژینەوە:

بایەخی توێژینەوەکە لەوەدایە، لایەنێکی گرنگ و پڕ بایەخی بابەتی ڕێبازی توێژینەوەی زانستی دەخاتەڕوو کە (ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوییە وەك یەکێك لە خاسیەتەکانی توێژینەوەی زانستی)، بە یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی توێژینەوەی زانستی دادەنرێت، کاردەکاتە سەر کوالێتی و ناوەرۆکی هەر توێژینەوەك لە هەر بوارێکدا ئەنجام بدرێت.

**ئامانجی توێژینەوە:**

هەر توێژینەوەیەکی زانستی کە ئەنجام دەدرێت چەند ئامانجێکی زانستی لەخۆدەگرێت، ئێمەش لەم توێژینەوەیەدا (ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی وەك یەکێك لە خاسیەتەکانی توێژینەوەی زانستی) ئامانجمان ناساندنی چەمکی (ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی)یە، هەروەها دەرخستنی (ڕەهەندەکانی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی)یە، بەجێبەجێکردنی بابەتەکە بەسەر نامەیەکی ماستەردا.

**گرفتی توێژینەوە:**

لە کارەکەماندا گرفتی جۆراوجۆر هاتە پێشمان لەوانە:

١. نەبوونی سەرچاوەی پێویست بە زمانی کوردی لەسەر بابەتی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی.

٢. بابەتی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی بابەتێکی ئاڵۆزە، ئەم بابەتە لە زۆر شوێن و جێگەدا تێکەڵکراوە لەگەڵ بابەتەکانی: ڕاستگۆیی(الصدق) و جێگیری(الثبات)، لەکاتێکدا ڕاستگۆیی و جێگیری ئامرازن، ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی خاسیەتن.

٣. تەنانەت لەو سەرچاوانەی بە زمانی عەرەبیش لەبەردەستن ئەوانیش لە زۆر شوێندا ئەم بابەتەیان تێکەڵ بە ڕاستی و و ڕاستگۆیی زانستی (الامانة العیلمیة)، کردووە.

گریمانەی توێژینەوە:

گریمانەی توێژینەکەمان لەم خاڵانەدا دەخەینەڕوو:

١. ڕاستیەتی باوەڕپێکراوی، چ کاریگەریەکی لەسەر توێژینەوەی زانستی هەیە؟

٢. ئایا ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، لە لایەن توێژەرانەوە بووە بە بابەتێکی گرنگ؟ توێژەران هیچ بایەخێکیان پێداوە؟

٣. ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی چەندە کار لە جۆر و کوارلێتی توێژینەوەی زانستی دەکات؟

**میتۆدی توێژینەوە:**

بەگشتی میتۆد، ئامرازێکی دیاریکراوە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو لە توێژینەوەی زانستیدا، هەر توێژینەوەیەکی زانستیش پشت بە میتۆدێکی تایبەت بە خۆی دەبەستێت، لێرەدا سوودمان لە میتۆدەکانی (وەسفی)مان وەرگرتووە، بەم ڕێگایانەی خوارەوە:

١. ناساندن و کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی

٢. دەرخستن و بەراوردکردنی ڕادەی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستیدا

**پلانی توێژینەوە:**

جگەلە پێشەکی پلانی توێژینەوەکەمان دابەشکردووە بۆ دوو بەش، لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بە چوارچێوەی توێژینەوە داوە لەڕووی (گرنگی توێژینەوە، ئامانجی توێژینەوە، گرفتی توێژینەوە، گریمانەی توێژینەوە، میتۆدی توێژینەوە، پلانی توێژینەوە). لە بەشی دووەمی توێژینەوەکەمان بەسەر سێ باسدا دابەشکردووە، لە باسی یەکەمدا چەمکی توێژینەوەی زانستی، باسی دووەم ١:١چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستی ١:٢ چەمکی ڕاستییەتی، ١:٣ چەمکی باوەڕپێکراوی، ١:٤ پەیوەندی نێوان ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، باسی سێیەم ٢:١ چۆن گرنتی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی بکەین لە توێژینەوەی زانستیدا؟ ٢:٢ چۆن ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەدا بنووسین؟ پاشان توێژینەوەکەمان، بە ئەنجام و ڕاسپاردە و لیستی سەرچاوەکان کۆتایی پێهێناوە.

## بەشی دووەم

### باسی یەکەم: چەمکی توێژینەوەی زانستی

هەر لەوکاتەوەی مرۆڤایەتی پێی ناوەتە سەر زەوی هەمیشە ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی ژیانی بووەتە جێگەی تێڕامانی هۆش و بیری داگیرکردووە، بەدوای لێکدانەوەیەکی باوەڕپێکراودا گەڕاوە هەتا بە ڕاستی ڕووداوەکان بگات، بۆ ئەم مەبەستە قۆناغ لە دوای قۆناغ داهێنانی کردووە هەتا ئەو کاتەی مرۆڤ پشتی بە بیرۆکەی زانستی بەست و تێگەیشتنی زانستی هاتەکایەوە، زانستیش «چالاکیەکی مرۆڤە کە ئامانجی تێگەیشتنی دیاردە سروشتییە هەمەجۆرەکانە لە ڕێی دۆزینەوەی ئەو پەیوەندی و یاسایانەی کە کۆنترۆڵ و پێشبینی دیاردەکان دەکەن و پەیبردنن بەو

ڕێگایانەی کە گونجاون بۆ کۆنترۆڵ و پێشبینیکردنی دیاردەکان، زانست چالاکیەکی ئاڕاستەکراوە بەمەبەستی وەسف و پۆلێنی ئەو دیاردانەی لێیان دەکۆڵێتەوە، لەوەش زیاتر پەیوەندی نێوان دیاردە جیاوازەکان دەدۆزێتەوە، چونکە بەتەنها تێگەیشتن لە دیاردەکان بەس نییە بۆ بەرقەرارکردنی زانست»[١].

زانست بە خۆی و ئامانجەکانی کە (تێگەیشتن و پێشبینیکردن و کۆنترۆڵکردن) دەگرێتەوە لە وەسفکردنی دیاردەکان، بەوەی چۆن لە ڕووداو و دیاردەکان تێبگەین؟ پێشبینی مرۆڤ چیە بۆ داهاتووی دیاردەکان؟ کەی مرۆڤایەتی دەگات بە کەمکردنەوەی کاریگەریەکان و کۆنترۆڵکردنی دیاردەکان.

زانست بۆ گەڕان و دەرخستنی ڕاستی ڕووداوەکان پێشت بە توێژینەوە دەبەستێت، «توێژینەوە لە ڕووی زمانەوانییەوە، ماناکەی بریتییە لە داواکردن، گەڕان، پشکنین، گەیشتن بەوپەڕی ڕاستییەك لە ڕاستییەکان، یان کارێك لە کارەکان»[٢]، هەر پەیوەست بەلایەنی زمانەوانی وشەی (توێژینەوە) ئەم مانایانە لەخۆدەگرێت «(بەدوایدا گەڕا، پشکنی، هەڵیکۆڵی، هەڵیکەند، بەدوایداچوو)، دەشوترێت: وتوێژیان کرد، واتە گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، هەردووکیان گفتوگۆیان لەگەڵ یەکدیدا کرد، هەوڵیدا ڕاستەقینەی مەسەلەکە بزانێت کۆیەکەشی لە زمانی عەرەبیدا (الباحث)ە«[٣]، لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی»(Search) یان (Research)» [٤] بۆ توێژینەوە بەکاردێت.

توێژینەوەش چەندین پێناسەی بۆ کراوە. هەروەك توێژینەوە «ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلە کە توێژەر لە بابەت کار و بەڵێننامەکەی پێشکەشی دەکات بەو مەرجەی ڕاپۆرتەکە هەموو قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەکە لەخۆبگرێت هەر لەو کاتەی کە (بیرۆکە) بووە هەتا دەگات بە ئەنجامە(تۆمارکراو و ڕێکخراوەکان)، کە بە

---

١. سەرکەوت جەمال محەمەد، ڕێبازی لێکۆڵینەوەی دەرونزانی و پەروەردەیی، چاپی ئەلکترۆنی(pdf)، پاییزی ٢٠٢٠، لا١٥.

٢. د. غازی عینایەت، ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی(بەکالۆریوس، ماستەر، دکتۆرا)، و: بەهرە محەمەد عەلی، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ئارا بۆ توێژینەوەی زانستی مەڵبەندی گشتی سلێمانی، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦ ، لا٦.

٣. حوسێن نزار فەیزوڵڵا، پوختەیەک لە ڕێبازی توێژینەوە، و: د. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، چاپخانەی هێڤی، چ١، هەولێر، ٢٠١٦، لا٨.

سەلماندن و بەڵگەنامە و زانیاری(داتا) پشت ئەستوورە»[1].

ئەگەر توێژینەوە گەڕان و قوڵبوونەوە بێت لە بابەتێکی دیاریکراو بەشێوەیەکی زانستی، ئەوە توێژەریش «ئەو کەسەیە کە دەگەڕێت بەدوای ڕاستیەکی ئەوتۆدا، یان کۆشش دەکات بۆ دۆزینەوە و دەرکەوتنی شتێکی تازە«[2].

توێژینەوەی زانستی وەك بابەتێکی تێهەڵکێش لە هەردوو چەمکی توێژینەوە(گەڕان) چەمکی زانست، پێکدیت و لە زمانی «ئینگلیزیدا وشەی (Scientific Research)»[3]بۆ بەکاردێت.

مەبەست لە توێژینەوەی زانستی «کورتکردنەوە و پشکنینێکی وردە بۆ ئاشکراکردنی زانیاری و ئەو پەیوەندییە نوێیانەی کاردەکەنە سەر گەشەکردنی دۆخی مەعریفیی و لێکۆڵینەوەکانی تر»[4]، یاخود توێژینەوەی زانستی «ئامرازێکی زانستییە هۆیەکە بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی دیاریکراو، بە ڕێگەیەکی کورت و پوخت، بە کۆکردنەوەی بەڵگەکان دەگەین بە لێکۆڵینەوەیەکی دروست، بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان. لەکاتی بوونی کێشەیەکی دیاریکراو، بەهۆی چەند ڕێسایەکی گشتی»[5]. کەواتا توێژینەوەی زانستی گەڕانێکی ورد و زانستییە و بەپێی یاسا و ڕێسایەکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت، بەگرتنەبەری ڕێبازێکی زانستی، بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەك یان گرفتێك کە ڕوویداوە یاخود دەشێت ڕووبدات لە داهاتوودا. توێژینەوەی زانستی بەگشتی بەدیهێنانی چەند ئامانجێك لەخۆدەگرێت، «ئامانجی لێکۆڵینەوە لە یەکێك لەم ئامانجانەی خوارەوە دەرناچێت:

---

١. سادق ئەحمەد عوسمان ڕوستایی، فەلسەفەی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستییانە، گۆڤاری پەروەردە و فێرکردن، لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ژمارە (٩)ی ساڵی ٣١٠٢، ل١١١.

٢. صەلاحەدین ئەلهەواری، بنەماکانی لێکۆڵینەوەی زانستی، و: عباس محەمەد ئەمین، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی نارین، چ١، هەولێر، ٥١٠٢، ل٥١.

٣. محمد مسعد یاقوت، أزمة البحث العلمی فی مصر والوطن العربی، دار النشر للجامعات، ط١، مصر، ٧٠٠٢، ص١١.

٤. فاطمة عوض صابر، میرڤت علی خفاجة، أسس و مبادئ البحث العلمی، مکتبة و مطبعه الاشعاع الفنیة، ط١، اسکندریة، ٢٠٠٢، ص٥٢.

٥. د.کمال دشلی، منهجیة البحث العلمیة، مدیریة الکتب و المطبوعات الجامعیة، منشورات جامعة حماة، ٦٠٠٢، ص١٣.

١. داهێنانی شتێك كە نەبووە، واتە پێكهێنانی بابەتێكی نوێ.
٢. زیندووكردنەوەی كۆن، واتە وردبینیكردنی بابەتێكی كۆن بە ڕێگەیەكی زانستی نوێ
٣. ڕوونكردنەوەی نادیار، واتە تاوتوێكردن و ڕاڤەی بابەتێك و دیاریكردنی هەڵەكانی.
٤. كۆكردنەوەی بابەتە پەرتەوازەكان و ڕێكخستنیان.
٥. فراوانكردنی بابەتێكی پوخت، یان كورتكردنەوەی بابەتێكی درێژ»[١].

## باسی دووەم:

١:١ ڕاستییەتی(المصداقیة) و باوەڕپێكراوی(الموثوقیة)

ڕاستییەتی و باوەڕپێكراوی وەك خاسیەتێك لە توێژینەوەی زانستیدا، لەڕووی زاراوەوە هاوتایە لەگەڵ وشەكانی (المصداقیة و الموثوقیة)ی عەرەبی «هەر چەندە لە سەرەتادا ئارەزوویەك هەبوو بۆ كرانەوە لە زمانی عەرەبیدا، بەڵام نەتوانرا مانایەكی ورد بۆ هەر دوو وشەكە دابتاشرێت، ئەوەبوو سوود لە وشەی (موثوق)ی عەرەبی وەرگیرا، وەك هاومانایەك بۆ وشەی(Reliable)ی ئینگلیزی و وشەی (صلاحیة) بە وشەی (Validity)ی ئینگلیزی»[٢]، بەڵام لەڕاستیدا تاڕادەیەك ئەو دوو دەستەواژەیە مانایەكی ورد و پڕ بە پێستی وشەكە دەرناخەن و نەنگییەك لە وەرگێڕانەكەدا هەیە، چونكە وشەی «(المصداقیة) كە لە زمانی كوردیدا وشەی (ڕاستییەتی)»[٣]، لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (Validity)»[٤]بۆ بەكارهاتووە، هەروەها «وشەی (الموثوقیة) ی عەرەبی لەزمانی كوردیدا وشەی (باوەڕپێكراو)» [5]لە «زمانی ئینگلیزیدا وشەی

١. تەڵاڵ مەجزوب، و: مەریوان عەبدول، ڕێبازی لێكۆڵینەوە و ئامادەكردنی لێكۆڵینەوەیەكی تیۆری و پراكتیكی، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧، لا٣٢٧

٢. مركز الابحاث والمنشورات العلمیة والاوروبي، CPRSE، الموثوقیة و الصلاحیة، ٢٨/٦/٢٠٢٠، الموقع الكتروني
https://esrpc.com/ar/post/validity-reliability?fbclid=IwAR3NAm8L85tJhSpmk8hzYLsPLFdrXNGUEHyyzyUUlnVbQHCc9BYWAvwUAHg

٣. ڕزگار كەریم، فەرهەنگی ژیر، عەرەبی – كوردی، چاپخانەی مەهارات، چ٢، لەبڵاوكراوەكانی دەزگای نەشری ئیحسان، تهران، ٢٠٠٧، لا٦٤٠.

٤. سەلام ناوخۆش، فەرهەنگی دوانەی ئۆكسفۆردی ئینگلیزی-كوردی، كوردی-ئینگلیزی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چ٣، هەولێر، ٢٠٠٦، لا٣٩٢.

٥. ڕزگار كەریم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٩٦.

(Credibility)»[15] یان (Reliability)[2]، بۆ بەکارهاتووە.

کەچی وشەی (صلاحية)، بەپێی فەرهەنگی (ژیر) بەواتایەکی نزیك لە «(دەسەڵات)»[3]، یاخود (چەسپاندن) دێت، ئەمەش نابێت بە هاومانایەك بۆ وشەی ڕاستییەتی، ڕەنگە پەیوەندی بە خودی توێژەریشەوە هەبێت، چونکە هەر توێژەرە و بە مانایایەك گوزارشت لە وشەکان دەکات و وشەکان بەکاردەهێنێت، بەگشتی توێژەران ڕوانگەیەکەی هاوبەشیان نییە لەو ڕووەوە.

هەرچی «ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوییە لە توێژینەوەی زانستیدا بە گرنگترین ئەو خاڵانە دادەنرێت، کە وەك ڕێگەیەکی زانستی یەکلاکەرەوە تەماشا دەکرێت، بۆ جیاکردنەوەی توێژینەوەی زانستی لە توێژینەوەی شکڵی»[4]

ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە هەیە، پشت بە پێوەری تایبەتمەند دەبەستن، ئەگەر بە نموونە مێژوو وەربگرین، ئەوا دەبێت «هەندێك خەسڵەت و بۆچوون هەیە و پێویستە لای هەموو توێژەرێك هەبێت بەتایبەت لە بواری توێژینەوەی مێژوویدا، ئەویش بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی ئەو بیرۆکەیەی کە ناشێت و ناکرێت بخرێتەوە ژێر تێبینی ڕاستەوخۆوە، ئەو خەسڵەتانەش بریتین لە (وردی، ڕاستی و دروستی، ڕاستگۆیی هزریی، دوورکەوتنەوە لە دەمارگیریی و حەزوئارەزوی تاکەکەسی، هەروەها بێلایەنی لەڕووی نەژادی بیروباوەڕەوە، بوونی بەڵگەی پێویست بۆ گەیشتن بە ئەنجام و بڕیاردان)، هیچ گومانێك لە بایەخی زانستی توێژینەوەی مێژووی نییە ئەگەر بنەماکانی (وردی، بابەتی بوون، دروستی، ڕاستگۆیی و ئەمانەتی هزری، پێوانەی چەندێتی، پەیبردن بە پەیوەندییەکان و...هتد) لەخۆ نەگرتبێت»[5].

---

١. سەلام ناوخۆش، سەرچاوەی پێشوو، لا١٨.

٢. سەلام ناوخۆش، هەمان سەرچاوەی ، لا ٣٩٢.

٣ . ڕزگار کەریم، سەرچاوەی پێشوو، لا٦٣٣.

٤ . الاوائل للخدمات التعليميه، الموثوقية و صدق الدراسات فی الابحاث العلمية، جمهورية مصر العربية، ٢/٩/ ٢٠١٩، الموقع الكتروني

https://alawaael.com/%D8%A7%D9%84%D9%85%D9%88%D8%AB%D9%88%D9%82%D9%8A%D8%A9-%D9%88%D8%B5%D8%AF%D9%82-%D8%A7%D9%84%D8%AF%D8%B1%D8%A7%D8%B3%D8%A7%D8%AA-%D9%81%D9%8A-%D8%A7%D9%84%D8%A3%D8%A8%D8%AD%D8%A7%D8%AB-%D8%A7%D9%84/?fbclid=IwAR0L6gzN78ofVHgPcTPs3e1WKf4XUBSXtUgBLfL2h5KEIo0YV_3NRXOe__4

٥ . د. سابیر بۆکانی، میتۆدی توێژینەوەی زانستی، چاپخانەی چوارچرا، چاپی دووەم، سلێمانی،

بەگشتی لە زۆربەی سەرچاوەکاندا وشەی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، بە گوزارشتی جیاواز هاتووە لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا بە ڕاستی و جێگیری، یاخود ڕاستگۆیی و نەگۆڕی هاتووە، بەڵام هەموویان گوزارشتن لەو بابەتانەی پەیوەندی بە توێژینەوەی زانستییەوە هەیە و لە هەندێك شوێن وەك خاسیەت یان سیفەت لەهەندێك شوێنی تر وەك ئامرازێك لە توێژینەوەی زانستیدا بەکارهاتووە، لە دەروونناسی و پەروەردەدا بە تایبەت لە ڕێگاکانی (چاوپێکەوتن، فۆڕمی ڕاپرسی، تێبینیکردن، پێوەر) وەك ئامرازێك بۆ دڵنیابوون لە ڕادەی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی بەکارهاتووە، لە هەندێك بابەتی وەك (مێژوو، جوگرافیا، کۆمەڵناسی، ڕاگەیاندن ... هتد) سەرەڕای ئەوەی وەك ئامراز دەتوانرێت سوود لەو دووچەمکە وەربگیرێت، کەچی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی بەشێکە لە مەرج وخاسیەتی توێژینەوەی زانستی، لێرەدا بە مانایەکی فراوانتر و گشتگیر تر لە ئامرازی توێژینەوە بەکاردەهێنرێت، تەنانەت بەسەر خودی ئامرازەکانی توێژینەوەشدا جێبەجێ دەبێت.

### ١:٢ چەمکی ڕاستییەتی

ڕاستییەتی لە «زمانی ئینگلیزیدا بە (Validity)»[١] لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی بەریتانیدا واهاتووە ڕاستییەتی «حاڵەتێکە لەڕووی یاسایی و فەرمییەوە قبوڵکراوبێت، یان حاڵەتێکە کە شتێکی لۆجیکی و ڕاست بێت»[٢] ڕاستیەتی لە سیفەتدا (بریتییە لە بەراوردکردنی نێوان ئەوەی کە دەوترێت لەگەڵ ئەوەی کە لە واقیعدا هەیە، بەوەی هەتا چەند ئەوەی دەوترێت و ئەوەی لە واقیعدا هەیە لە یەکەوە نزیك وەیان هەمان ئەنجامیان هەیە، هەروەها ڕستگۆیی ئاماژەیە بۆ بەراوردکردن لە نێوان ئەو شتەی کە دەپێورێت جا ئەو شتە کەسێك یان دەزگایەك یاخود هەر شتێك بێت، کە بپێورێت، کە دەڵێین ڕاستییەتی واتا دەبێت ئەنجامەکانی لەیەکەوە نزیك بن)[٣].

---

٢٠٢٠، لا٦١.

١ . سەلام ناوخۆش، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٧٧.

٢ . Stevenson, A. (Ed.). (2010). Oxford dictionary of English. Oxford University Press, USA

٣. المجلة العربية للعلوم و نشر الابحاث ajsrp ، الموثوقية و المصداقية فی البحث العلمی، موقع الكتروني https://ajsrp.com/%D8%A7%D9%84%D9%85%D9%88%D8%AB%D9%88%D9%82%D9%8A%D8%A9-%D9%88%D8%A7%D9%84%D9%85%D8%B5%D8%AF%D8%A7%D9%82%D9%8A%D8%A9.





بەڵام ڕاستییەتی لە پێوانەدا پێناسەکراوە بەوەی «پێوانەی وردی تاقیکردنەوەکان دەکات، کە کار لەسەر ئەنجام و کوالێتی(جۆریەتی) و چۆنایەتی توێژینەوەکە دەکات»[1].

هەروەها ڕاستییەتی زانستی «لە توانای توێژەر بۆ بڕیاردان لەسەر کاروبارە زانستییەکان و هەڵسەنگاندنیاندا خۆی دەبینێتەوە، هەروەها توانای توێژەرە لە خستنەڕووی بیرۆکە و زانیارییەکان بە ڕێگەیەکی ڕاست کە ناوەندگەراییەکەی بریتییە لە (شێوازی باش و ئاشکرا، دەربڕینی سەرکەوتوو، پابەندبوون بە ڕێساکانی زمان و نووسین و داڕشتن دوور لە ئاڵۆزکاری)»[2].

ڕاستییەتی وەك ئامرازێکی شیکارکردن، لە شیکاری ناوەڕۆکدا «بەندە بە شێوازی وەرگرتنی سەمپڵ و ئاستی نوێنەرایەتی کردنی بۆ کۆمەڵگەی توێژینەوە، ڕۆشنی پۆلێنی دەستەکان و بەرزی هاوکۆلکەی جێگیری (باوەڕپێکراوی)یەوە»[3].

ئەگەر توێژینەوەیەك «پشت بە ڕاستییەتی ببەستێت ئەوە لەکۆتاییدا کۆمەڵێك دەرئەنجامی باشی دەبێت کە یەك دەگرێتەوە لەگەڵ تایبەتمەندیی و گۆڕانکارییە ڕاستییە بەرجەستەکراو و مەعنەوییەکان، بۆ نموونە: ئەگەر لە وڵاتێکدا توێژینەوەیەك ئەنجام بدەین، پشت بە ڕاستییەتی ببەستێت، لەسەر بابەتی (بێکاریی و بەرئەنجامەکانی)، کەواتا لە کۆتایی توێژینەوەکەدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە هۆکاری سەرەکی پشت تاوانەکان دەگەڕێتەوە بۆ بێکاری، ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت کە توێژینەوەکەمان ڕاستییەتی تێدایە لەگەڵ دەرەنجامەکەی یەکدەگرێتەوە و توێژینەوەیەکە سەرکەوتووە، چونکە بەرەنجامەکەی و ئەوەی لە واقیعدا هەیە هەمان ئەنجامیان هەیە، بەڵام ئەگەر بۆ هەمان توێژینەوە لە دەرەنجامدا گەیشتین بەوەی کە خودی مرۆڤ بە سروشت هەر لە ناخەوە حەز بە تاوان دەکات، ئەوە دەڵێین نەخێر ئەو توێژینەوەیە ڕاستییەتی تێدا نییە، چونکە عەقڵ و ڕاستی ئەوە ڕەتدەکەنەوە، هەموو مرۆڤێك بە سروشت لە ناخەوە ئارەزووی

---

1. Heale, R., & Twycross, A. (2015). Validity and reliability in quantitative studies. Evidence-based nursing, 18(3), 66-67

٢. د. غازی عینایەت، سەرچاوەی پێشوو، لا٦٧.
٣. د. سابیر بۆکانی، سەرچاوەی پێشوو ، لا٩١.

کوشتنی تێدابێت، که واتا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت دەرەنجامی توێژینەوەکە ڕاستیەتی تێدا نییە و لاوازە»[1].

لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەی سەرەوە، بە جیاوازی ئەو وشانەی گوزارشت لەڕاستییەتی دەکەن، دەتوانین بڵێین، ڕاستییەتی هەم خاسیەتە هەم ئامراز، لە توێژینەوەی زانستیدا جێگا و پێگەیەکی گرنگی هەیە لە سەلماندنی ڕاستی و دروستی توێژینەوەدا، ڕاستیەتی بە مانا فراوانەکەی کاریگەری لەسەر جۆر و کوالێتی توێژینەوەی زانستی هەیە، ڕادەی گرنگیی و ڕاستییەتی و توێژینەوەکە دەخاتەڕوو.

سەبارەت بە جۆرەکانی ڕاستییەتی لە توێژینەوەی زانستیدا، ئەوا ڕاستییەتی بەسەر جۆری جیاوازدا دابەشکراوە، هەر چەندە ئەم دابەشکردنە جیاوازی هەیە لای زانایان و توێژەرانی بوارەکە بەتایبەت لای قوتابخانە دەروونناسیەکان بەپێی ئەو پێکهاتە زانستییەی «زانایانی کۆمەڵەی دەرونناسی ئەمەریکی کردوویانە ڕاستییەتیان دابەشکردوە بەسەر چوار جۆردا (ڕاستییەتی ناوەڕۆک، ڕاستییەتی بونیادنان، ڕاستیەتی ئەزموونی، کە هەردوو دەستەواژەی پێشبینی دروست و پێکەوە بەستن کۆدەکاتەوە، هەرچی گەشەپێدەرانی تاقیکاریی و توێژەرانی بواری پەروەردەییە ڕاستییەتیان دابەشکردووە بەسەر (ڕاستییەتی ڕواڵەت، ڕاستییەتی لۆژیکی، ڕاستییەتی جیاکاریی و بەدەر لەشیکردنەوە و ئاڕاستەی گشتاندن، بەڵام ئەم دابەشکردنە ڕووبەڕووی ئاڵنگاری ئەوە دەبێتەوە کە لە مانا تەکنیکییەکەی دابشۆرێ»[2]

بەدەر لە زانایانی ئەمریکی لە زۆر توێژینەوەدا بەشەکانی ڕاستییەتی(المصدقية) لە توێژینەوەی زانستیدا، دابەشکراوە بۆ دووجۆری سەرەکی ئەوانیش:

١. ڕاستییەتی ناوەکی(المصداقية الداخلية): کە توانای ئامرازەکانە یان ئەو ڕێکارانەیە لە توێژینەوەکەدا بەکاردەهێنرێت و پێوانەی ئەوەی کە تۆ پێویست پێیەتی بی پێوی.

---

١ . المجلة العربية للعلوم و نشر الابحاثajsrp ، الموثوقية و المصداقية فى البحث العلمي، الموقع الكترونى.

٢ . حيدر إبراهيم ظاظا، درجة توافق دلالات صدق وثبات الاختبارات المقننة المستخدمة في رسائل الماجستير المقدمة في كليات التربية في الجامعات الأردنية مع دلالات صورها الأصلية، الأردن: عمادة البحث العلمي/ الجامعة الأردنية، ٢٠١١، صفحة ٢٤٠٠، جزء ٣٨-٢.

٢. ڕاستییەتی دەرەکی(المصداقية الخارجية): دەستبەجێ دەتوانرێت ئەنجامەکان گشتگیر بکرێت لە دەرەوەی لێکۆڵینەوەکە.

هەردوو جۆری ڕاستییەتی پەیوەندییان بە هەڵسەنگاندنەوەی ڕاستییەتی لێکۆڵینەوەیەک یان ڕێوشوێنێکەوە هەیە»[١]، دەتوانین لە جۆرەکانی ڕاستییەتیدا ئەوە بڵێین، کە ڕاستیەتی ناوەکی پەیوەندی بەو هۆکارانەوە هەیە کە کاریگەری لەسەر ڕاستییەتی هەیە، بەڵام ڕاستییەتی دەرەکی، ئەنجامەکان لەسەر شوێن و کات ناوەستن بەڵکو گشتگیر و هەمەلایەنەیە.

### ١:٣ چەمکی باوەڕپێکراوی(الموثوقية)

لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی بەریتانیدا هاتووە باوەڕپێکراوی «سیفەتێکە لەوانەیە ڕاست بێت یان ڕاست نەبێت»[٢]، هەروەها باوەڕپێکراوی لە زمانی ئینگلیزیدا بەرانبەر بە «وشەی (Credibility)»[٣]ی یاخود (Reliability) دێت، بەوە پێناسەکراوە «باوەڕپێکراوی دەکرێت پشتی پێ ببەسترێت بەشێوەیەك کە جێی باوەڕ بێت»[٤].

باوەڕپێکراوی لە سیفەتدا بەوە پێناسە دەکرێت کە «باوەڕپێکراوی واتا پشتبەستنە بە هەواڵێك یان سەرچاوەگەلێك کە بڕوات وایە باوەڕپێکراون. بەڵام دەکرێت باوەڕپێکراویش نەبن»[٥]یان «ئاماژە بۆ ئەو ئاستە دەکات کە دەتوانین پشتی پێببەستین، لە ئەنجامی پێوانەیی یان ژماردن یان تیبەتمەندییەکان، بۆ ئەوەی شێوازێکی وردتر بێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری دروست و تەواو لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا، دەتوانین بڵێین تاقیکردنەوەکان پشتیان پێ دەبەسترێت ئەگەر ئەنجامی کۆتاییەکەی، دژیەك نەبن، پێویستی بە گۆڕانکاری نەبێ هەموو کات»[٦].

---

١. ماكلويد ، شاول. «شاول ماكلويد.» ببساطة علم النفس ، علم النفس ببساطة ، ١ يناير ١٩٧٠، موقع الكتروني https://ar.strephonsays.com/difference-between-validity-and-reliability#menu-1

2. Stevenson, A. (Ed.). (2010). Oxford dictionary of English. Oxford University Press, USA

٣. سەلام ناوخۆش، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨١.

٤ . سەلام ناوخۆش، هەمان سەرچاوە، لا ٢٩٣.

٥ . الفرق بين الموثوقية والمصداقية/ الموثوقية مقابل المصداقيه، ٢٠١٧، من الموقع الكترونى ar.weblogographic https://ar.weblogographic.com/difference-between-reliability-and-credibility-9707-9707

٦ . ماكلويد ، شاول. «شاول ماكلويد.» ببساطة علم النفس ، علم النفس ببساطة ، الفرق بين الصلاحية و

باوەڕپێکراوی لە پێوانەدا «بەشێکە لە ڕاستگۆیی لە توێژینەوەی زانستیدا، چونکە ڕاستگۆیی گرەنتی جێگیری دەکات، باوەڕپێکراوی لە مانا گشتیەکەیدا ئەوەیە، ئەو تاقیکردنەوە و کارانەی توێژەر دەیکات، هەمان ئەنجام بەدەستەوە بدات ئەگەر هاتوو دووبارە بکرێتەوە بەسەر هەمان کۆمەڵەدا لە هەمان بارودۆخدا لە کاتێکی جیاوازدا»[1]. دەتوانین بڵێین، باوەڕپێکراوی چ وەك خاسیەت یان وەك ئامراز، ڕادەی ئاستی بەرزی ئەو زانیارییانە دەچەسپێنێت، کە لە توێژینەوەکەدا هاتووە، وەك پاڵپشتێك بۆ چەسپاندن و دووپاتکردنەوەی ڕادەی ڕاستگۆیی داتا و زانیارییەکانی توێژینەوەکە، لەبەرئەوەی ڕەنگە زانیاری هەبێت لە توێژینەوەکەدا ڕاستبن، بەڵام واقیعی و باوەڕپێکراو نەبن. ئەمەش کاردەکاتە سەر ئەنجامەکانی توێژینەوەکە، گومان دەخاتە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکان.

سەبارەت بە جۆرەکانی باوەڕپێکراوی(الموثوقية)، لە توێژینەوەی زانستیدا، بەشێوەیەکی گشتی «دوو جۆر باوەڕپێکراوی هەیە کە بەکاری دەهێنین لەکاتی هەڵسەنگاندنی متمانە لە تاقیکردنەوەدا. ئەوانیش:

١. باوەڕپێکراوی ناوەکی(الموثوقية الداخلية): گونجانی پێوانەیە لە ناو خۆیدا.

٢. باوەڕپێکراوی دەرەکی(الموثوقية الخارجية): چەند پێوانەیەکی جیاوازە لە بەکارهێناندا».[21]

---

الموثوقية، الموقع الكتروني.
https://ar.strephonsays.com/difference-between-validity-and-reliability

١ . مبتعث، للدراسات و الاستشارات الاكاديمية، الثبات مفهومه و الطريق حسابەوالعوامل المؤثرة فيه، الموقع الكتروني.
https://www.mobt3ath.com/dets.php?page=102&title=%D8%A7%D9%84%D8%AB%D8%A8%D8%A7%D8%AA%20_%D9%85%D9%81%D9%87%D9%88%D9%85%D9%87%20_%D9%88%D8%B7%D8%B1%D9%82%20_%D8%AD%D8%B3%D8%A7-%D8%A8%D9%87%20_%D9%88%D8%A7%D9%84%D8%B9%D9%88%D8%A7%D9%85%D9%84%20_%D8%A7%D9%84%D9%85%D8%A4%D8%AB%D8%B1%D8%A9%20_%D9%81%D9%8A%D9%87&fbclid=IwAR1jNqhqlYQcu8srZsz10jXoPOpjpnX-obaXIXyTsV4JZP2SQsQehLSn0mA

٢١ . ماكلويد ، شاول. «شاول ماكلويد. ببساطة علم النفس ، علم النفس ببساطة، مصدر السابق، الموقع الكتروني
https://ar.strephonsays.com/difference-between-validity-and-reliability#menu-1

### ١:٤ ڕەهەندەکانی پەیوەندی نێوان ڕاستییەتی (المصداقیة) و باوەڕپێکراوی (الموثوقیة)

پەیوەندی نێوان ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی پەیوەندیەکی یەکانگیرە، لە زۆر باردا یەکتر تەواو دەکەن، زۆرجاریش ئەم دوو چەمکە بەیەکەوە بەکاردەهێنرێن، زۆرترین نزیکایەتیان هەیە بەڵام خاڵی جیاوازیشیان هەیە، لە هەندێك سەرچاوەدا ڕاستییەتی بە (ڕاستی یان ڕاستگۆیی) هاتووە و باوەڕپێکراوی بە (جێگیری) هەروەك «ڕاستی؛ جێگیری لەخۆدەگرێت و ڕوویەکە لە ڕووەکانی، ڕاستی گشتگیرترە لە جێگیری، چونکە جێگیری ئامرازی توێژینەوەیە بەڵگە نییە بۆ ڕاستی ئامرازەکە، ڕەنگە نمرەی تاکە کەسەکان وەك خۆی بێت و گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەیەت، بەڵام نمرەکەیان ڕاست نەبن و ئەو دیاردەیە یان ئەو بوارە نەپێوێت کە لە بنچینەدا ئامرازەکەی بۆ ئامادەکراوە، هەربۆیە دەکرێت بڵێین، هەموو ئامرازێکی ڕاست بە زەرورەت جێگیریشە، ئەگەر فۆڕم یان پێوەری ڕاست ئەوە بێت، کە پێویستە بیپورێت و بەوردی گوزارشت لە ئەدای ڕاستەقینەی تاکەکەس بکات، ئەوا لەهەمانکاتدا جێگیریشە، بەڵام فۆڕم یان پێوەری جێگیری مەرج نییە بە زەرورەت ڕاست بێت و ڕەنگە ئەرکێکی تر جێبەجێ بکات نەك ئەو ئەرکەی کە پێویستە جێبەجێی بکات»[١].

بەگشتی پەیوەندی نێوان ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لەم «خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١. باوەڕپێکراوی بەشێکە لە ڕاستێتی و سیمایەکە لە سیماکانی.

٢. ڕاستێتی فراوانتر و گشتگیرترە لە باوەڕپێکراوی.

٣. هەموو تاقیکردنەوەیەکی باوەڕپێکراو، مانای وانیە بەشێوەیەکی بنبڕ ڕاست بێت.

٤. هەموو تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینە ئەگەر ڕاستیتی تێدابێت، ئەوا باوەڕپێکراویشە»[٢].

---

١. د. سابیر بۆکانی، سەرچاوەی پێشوو، لا١٥٩.

٢. مبتعث، للدراسات و الاستشارات الاکادیمیة، الثبات مفهومه و الطریق حسابەوالعوامل المؤثرة فیه، الموقع الکترونی
https://www.mobt3ath.com/dets.php?page=102&title=%D8%A7%D9%84%D8%AB%D8%A8%D8%A7%D8%AA%20_%D9%85%D9%81%D9%87%D9%88%D9%85%D9%87%20_%D9%88%D8%B7%D8%B1%D9%82%20_%D8%AD%D8%B3%D8%A7-

لەگەڵ ئەوەی ئەم دوو چەمکە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، بەڵام جیاوازیشن «کاتێك تەماشای ئەو دوو زاراوەیە دەکەین وا هەستدەکەین تاڕادەیەك لەیەکەوە نزیکن، بەڵام جیاوازیش لە نێوانیاندا هەیە، چونکە ڕاستییەتی(المصداقية) زارەوەیەکە تاڕادەیەك قورسترە، ئەگەر وتمان بابەتێك ڕاستییەتی تێدایە واتا ئەو بابەتە لە (١٠٠٪) ڕاستە، بەڵام ئەگەر باسی خەڵکی یان یاسا، یاخود باسی سەرچاوەی زانیاری بکەین، ئەوە باسی باوەڕپێکراوی(الموثوقية)ە دەکەین، بەوەی چەندە ئەو بابەتە جێگەی متمانەن و دەتوانرێت پشتیان پێ ببەسترێت، واتا ئەو بابەت و سەرچاوانەی کە باسی ڕاستییەتی دەکات دەبێت تەواو دڵنیاین لە ڕاستییەتی، بەڵام لە باوەڕپێکراویدا ئەو سەرچاوانەی کە وەرمانگرتووە مەرج نییە لە (١٠٠٪) باوەڕپێکراوبن، چونکە باوەڕپێکراوی واتا پشتبەستنە بە هەواڵێك یان سەرچاوەگەلێك کە بڕوات وایە باوەڕپێکراون، بەڵام دەکرێت باوەڕپێکراویش نەبن، کەواتە لێرەدا جیاوازییەك هەیە لە نێوان هەردوو چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، ئەویش ئەوەیە کە ئەم دوو وشەیە (مرادیف) هاومانای یەك نین، بەڵکو (متقارب) لەیەکەوە نزیکن»[١١].

## باسی سێیەم:

### ٢:١ شێوازەکانی زامنکردنی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستیدا

بۆئەوەی توێژینەوەکانمان ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی تێدابێت، پێویستە ئاماژە بەشێوازەکانی گرنتی کردنی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی بکەین، هەتا بزانین چەندە گرنتی کردنی ئەم دوو چەمکە لە توێژینەوەی زانستیدا جێی بایەخی توێژەرانە لە توێژینەوەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین پشت بەم خاڵانە ببەستێت:

---

%D8%A8%D9%87%20_%D9%88%D8%A7%D9%84%D8%B9%D9%88%D8%A7%D9%85%D9%84%20_%D8%A7%D9%84%D9%85%D8%A4%D8%AB%D8%B1%D8%A9%20_%D9%81%D9%8A%D9%87&fbclid=IwAR1jNqhqlYQcu8srZsz10jXoPOpjpnX-obaXIXyTsV4JZP2SQsQehLSn0mA

١١ . الفرق بين الموثوقية والمصداقية/ الموثوقية مقابل المصداقيه، الموقع الكتروني https://ar.weblogographic.com/difference-between-reliability-and-credibility-9707-9707

١. ئەگەر ویستت چەند ئامرازێك بەكاربهێنیت بۆ جیاوازی لە نێوان سیفەتە دەروونییەكانی مرۆڤ یان ئاستی تایبەتمەندی فیزیکی، دەبێت لە توێژینەوەكەدا جیاوازییە ڕاستەقینەكە و ئەوەی كە لە ڕاستیدا هەیە زۆر لەیەكەوە نزیك بێت هەر لە یەكەم هەنگاوی توێژینەوەكەدا، لەكاتێكدا كە پلان دادەڕێژین بۆ كۆكردنەوەی زۆرترین داتای ورد بۆ توێژینەوەكە دەبێت پشت بەو سەرچاوانە ببەستین كە ڕاست و دروستن و باوەڕپێكراوی تێدا بەرجەستە بووە.

٢. هەمیشە دڵنیابە لەو كەرەستانەی كە لە پێوانەی توێژینەوەكەدا بەكاریان دەهێنیت، دەبێت ڕەسەن و كوالێتییەكی بەرز و سەرچاوەیەكی بەهێزی هەبێت، چونكە هەرچی توێژینەوەی زانستییە، دەبێت پشت بەو شێوازە ببەستێت، بۆ نموونە ئەگەر ویستت كۆمەڵێك داتا لەسەر سیفەتەكانی كەسێتی كۆ بكەیتەوە ئەوا دەبێت پشت بەو ڕوونكردنەوانە ببەستیت كە پێشتر زاناكان كۆكن لەسەری، واتا ڕاستن و جێگەی متمانە و باوەڕپێكراون، جگەلەوەی كۆمەڵێك پرسیاری ورد لەناو توێژینەوەكەدا دەرژێنێت.

٣. ئەگەر ویستت ئەنجامی توێژینەوەكەت گشتگیر بێت، دەبێت نموونە(سەمپڵ) ێكت هەبێت، هەموو لایەنەكانی جێبەجێ بكرێت بەسەر جوگرافیایەكی دیاریكراودا.

٤. لەكاتی كۆكردنەوەی داتا و زانیاریەكاندا، ئاگاداری سەرچاوەی متمانەپێكراو و باوەڕپێكراو بە، زۆر گرنگە دەرەنجامی توێژینەوەكەت ورد و ڕاست و بەهێزبن

٥. هەوڵبدە ئامرازەكانت بەهێز و وردبن لە هەموو هەنگاوەكانتدا، بەوردی كار لەسەر توێژینەكەت بكەیت، سوود لە ئەزمونی كەسانی شارەزا وەربگریت، لە توێژینەوەكەتدا بەشداریان پێ بكەیت.

٦. لەكاتی كۆكردنەوەی زانیاریدا ئاگاداربە زانیارییەكانت لەڕووی كات(زمن) ەوە، زۆر كۆن نەبێت، واتە نابێت جیاوازییەكی كاتی زۆر لە نێوان توێژینەوەكەت و سەرچاوەكاندا هەبێت، گرنگە ئەو سەرچاوانەی كە بەكاریان دەهێنیت تازە و نوێبن، بۆئەوەی بگەیت بە دەرەنجامی هەم تازە هەم دروست»[١١].

---

١١. المجلة العربية للعلوم و نشر الابحاث، الموثوقية و المصداقية فی البحث العلمی، ajsrp، الموقع الكترونی.

**٢:٢چۆنێتی نووسینی بەشەکانی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەدای زانستید**

نووسینی بەشەکانی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەی زانستیدا، کاتێك گرنگییەکەی دەردەکەوێت کە توێژەر بگەڕێتەوە بۆ ئەو توێژینەوانەی کە لەسەر هەمان بابەت کراوە، «باشتر وایە لە زۆر بەشی توێژینەوەدا، ڕاستیەتی(المصداقیة) و باوەڕپێکراوی(الموثوقیة) دیاری بکرێت، بۆئەوەی ئەوە دەرکەوێت چەندە گرنگیتانداوە بەم دوو فاکتەرە لە توێژینەوەکانتاندا و لە لێکدانەوەتان بۆ ئەنجامەکان پشتان پێ بەستووە، ئەمە دەبێتەهۆی ئەوەی لەناو ڕایگشتیدا باوەڕپێکراویی و ڕاستییەتی زیاتر بە لایەنی زانستی توێژینەوەکانتان ببەخشن. وەك لە خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

پێداچونەوەی ئەدەبی: توێژەرانی تر چیان کردووە بۆ کۆنترۆڵکردن و باشترکردنی ڕێگاکان، بۆ مسۆگەرکردنی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی

میتۆدناسی: چۆن پلانت داناوە بۆ توێژینەوەکەت بۆ دڵنیابوون و مسۆگەرکردنی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، ئەمە بەشی هەڵبژێردراو و قەبارەی (سەمپڵ)، بارودۆخی دەرەکی، تەکنیکەکانی پێوانەکاری لەخۆدەگرێت.

ئەنجامەکان: ئەگەر هەستای بە ژماردنی ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی بەهاکانی باس بکە، لەگەڵ ئەنجامە سەرەکیەکانی.

گفتوگۆکان: ئەمە بەشی سەرەکییە بۆ قسەکردن لەسەر باوەڕپێکراوی و ڕاستییەتی ئەنجامەکان، ئایا لە هەر نموونەیەکی هاوشێوەدا ڕەنگیداوەتەوە؟ ئایا بەهای ڕاستەقینەی شتەکانن لەهەمانکاتدا؟ ئەگەرنا، بۆچی؟

پوختە(ئەنجام): توێژەر تووشی هەندێك گیروگرفت دەبێت، لە سەلماندنی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، لە توێژینەوەدا بەسوود دەبێت ئەگەر باسیان بکات»[١١].

---

١١ . الموثوقیة و الصلاحیة، مرکز الابحاث والمنشورات العلمیهة والاوروبی، ESRPC، الموقع الکترونی https://esrpc.com/ar/post/validity-reliability?fbclid=IwAR3NAm8L85tJhSpmk8hzYLsPLFdrXNGUEHyyzyUUlnVbQHCc9BYWAvwUAHg

## دەرئەنــجام

لە دەرئەنجامی توێژینەوەکەدا دەگەین بەم ئەنجامانەی لای خوارەوە:

١. بەکارهێنانی چەمکی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی بەستراوە بە بەکارهێنانە ڕەسەنەکەیەوە کە زمانی ئینگلیزییە، چونکە وەرگێڕانی وشەکە هەم لە زمانی عەرەبی و هەمیش لە زمانی کوردیدا لەلایەن توێژەرانەوە چ وەك ئامراز یان خاسیەت وشە و گوزارشتی جیاجیای بۆ بەکارهێنراوە، بەنموونە وشەی (Validity) لە زمانی عەرەبیدا بە (صدق، صلاحیة، المصداقیة) و لە زمانی کوردیدا بە (ڕاستگۆیی، ڕاستی، ڕاستییەتی) بەکارهێنراوە، هەروەها وشەی (Reliable، Reliability، Credibility)، لە زمانی عەرەبیدا بە (الثبات، الموثوقیة) و لە زمانی کوردیدا بە (جێگیری، نەگۆڕی، پەسەند(پەسەندێیەتی) یاخود باوەڕپێکراوی) بەکارهێنراوە.

٢. ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە ڕاستێتییەوە هەیە بابەتگەلی ڕاستەقینە و واقیعین، تەواو دڵنیاین لە ئەنجامی ڕاستییەتیان، بەڵام ئەو بابەتانەی باس لە باوەڕپێکراوی دەکەن، دەشێت ڕاستبن یان هەڵە، واتا هەموو ڕاستییەك باوەڕپێکراوە بەڵام مەرج نییە هەموو باوەڕپێکراوێك ڕاستییەتی تێدا بێت.

٣. ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، وەك یەکێك لە خاسیەتەکانی توێژینەوەی زانستی، پێویستە لە هەموو توێژینەوەیەکدا، ڕەنگبداتەوە، خۆ ئەگەر هەر توێژینەوەیەك لە زانیاریی و ناوەڕۆك و پلان و میتۆد و ئیقتیباس و دەرئەنجام و سەرچاوەکانیدا، ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی تێدا ڕەچاو نەکرابێت ئەوا ئەو توێژینەوەیە کوالێتی و بەهێزی و گرنگییەکەی لەدەستدەدات ناتوانرێت وەك توێژینەوەیەکی زانستی هاوسەنگ و بابەتی لێی بڕوانین.

٤. ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، چ وەك خاسیەت یان وەك ئامرازی لێکۆڵینەوە، پێوەرن بۆ هەڵسەنگاندنی توێژینەوەی زانستی، گەرچی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی گشتگیرترە، لە ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی وەك ئامرازی توێژینەوە، چونکە ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی وەك ئامراز، لە چەند بابەتێکی دیاریکراوی وەك فۆرمی ڕاپرسی و چاوپێکەوتن و سەرنجداندا، بەرجەستە دەبێت، بەڵام ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی وەك خاسیەت، بەسەر تەواوی لایەنە جیاوازەکانی توێژینەوەی زانستیدا جێبەجێ دەبێت تەنانەت بەسەر خودی ئامرازەکانی توێژینەوەی زانستیشدا جێبەجێ دەبێت.

## ڕاسپاردەکـــان

لە کۆتایی توێژینەوەکەدا، پێشنیازی ئەم ڕاسپاردانە دەکەین، کە دەکرێت بکرێنە بناغەی بۆ توێژینەوەکان، بۆ ئەوەی توێژەران ڕاستییەتی باوەڕپێکراوی لە توێژینەوەکانیاندا ڕەنگبداتەوە.

١. پێشنیاز دەکەین توێژەران، لە توێژینەوەکانیاندا، گرنگی و بایەخی تایبەت بدەن بە بابەتی ڕاستییەتی و باوەڕپێکراوی، چونکە هەموو توێژەرێك بۆ ئەوەی توێژینەکەی باوەڕپێکراو بێت و بەشدار بێت لە چارەسەرکردنی کێشەیەك و دروستکردنی بڕیاردا، دەبێت ڕاستییەتی باوەڕپێکراوی تێدابێت لە دیسپلینی کارکردن و داتاو زانیاریی و سەرچاوەکانیدا.

٢. ڕاستیەتی و باوەڕپێکراوی وەك خاسیەتێك لە توێژینەوەی زانستیدا، بە پێوەر و هەڵسەنگاندنێکی باش دادەنرێت بۆ هەر توێژینەوەیەك، هەربۆیە پێویستە توێژەران لە توێژینەوەکانیاندا پەیڕەوی لە دروستیی و باوەڕپێکراوی بکەن.

٣. پێشنیاز دەکەین توێژەران، دووربکەونەوە لە زانیاری و داتای فەیك لە توێژینەوەکانیاندا، وردبن بەدواداچوونی تەواو بکەن لە وەرگرتنی ئەو داتا و زانیارییانەی لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی وەك (کتێب، توێژینەوەکان، نامە و تێزە زانکۆییەکان، دامودەزگا حکومییەکان و چاوپێکەوتن ... تاد)، شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن پێش بەکارهێنانیان لە توێژینەوەکانیاندا، بۆئەوەی دووربن لە هەڵە و کەموکوڕی و بێ متمانەیی.



نووسینی: ڕاز ئەسعەد

# گێڕانەوە ئاڵتونییەکان

## مێژوو و سیمبولێتی خشڵی ژن لە کۆمەڵی کوردەواریدا



خشڵ وەک بابەتێکی جوانکاریی و ئاماژەی چینایەتی و خۆدەرخستن، ڕەگوڕیشەی هێندەی قوڵاییەکانی مێژووە کەوناراکان و بگرە زیاتریش ڕۆدەچێتە نێو کەلتووری مرۆڤایەتییەوە، مێژووی بەکارهێنانی خشڵ نەک هەر بە قوڵایی مێژوودا شۆڕبووەتەوە، بەڵکو بۆ سەردەمی پێش مێژووش دەگەڕێتەوە، لە سەرەتای سەردەمی سروشتگەرایی و ئاوێزانبوونی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەی چواردەوری خۆیدا دەستپێدەکات، هەر لەم پێودانگەوە دەکرێت بڵێین، مرۆڤ لە پێش مێژووەوە بیری لە ڕازاندنەوەی جەستەی خۆی کردووەتەوە، واتە بەرلەوەی بیر لە پۆشاک و شاردنەوەی جەستەی بکاتەوە(١)، چونکە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤە سەرەتاییەکان لە ئەشکەوتەکانەوە بنەڕەتێک بوو بۆ بەکارهێنانی خشڵ، کاتێک کە ئاژەڵەکانیان ڕاودەکرد و ئێسک و پێستە و مووی جەستەیان وەک ئێکسسوارات و پێداویستی دیکەی سەرەتایی بەکاردەهێنا، لێرەوە دەستپێکرد و بەدرێژایی قۆناغ و سەردەمەکان بەکارهێنانی خشڵ درێژەی هەبووە و ئاماژەیەکی گرنگ بووە بۆ ئاشنابوون بە شێوازی ژیانی ڕۆژانە و کەلەپووری هەر کۆمەڵگایەک و ڕەنگدانەوە لەسەر مێژووی داهاتوو.

لەگەڵ بەرەو پێشچوونی قوناغەکان بەکارهێنانەکانیش بەرفراوانبوون، پەیدابوونی بەردە بەنرخەکان و عاج و گەوهەرەکانی دیکە بۆ خۆڕازاندنەوە لەڕووی مێژووییەوە ئاماژەیەکی گرنگ بوون بۆ شێوازی ژیان و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی تاکەکان لە کۆمەڵگەکاندا(٢).

لە کۆمەڵگەی کوردیشدا خۆڕازاندنەوە و بەکارهێنانی خشڵ بەشێکی دانەبڕاوی مێژووی ژیانی ڕۆژانەوە و کەلتووری تایبەت بە نەتەوەکە بووە، هەربۆیە سەیر نییە سەرنجی کوردناسان و ئەو بیانیانەی ڕاکێشاوە کە بە ناوچەکەدا تێپەڕیون و زۆربەیان ئاماژەیان بەجۆری گەوهەرەکان و شێوازی خۆڕازاندنەوەی ژنانی کورد کردووە.

ژن لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە بەکارهێنانی خشڵ و خۆڕازاندنەوە بێبەش نەبووە و ڕۆڵی کاریگەری هەبووە، لە ژیانی ڕۆژانە و بۆنەکان و تەنانەت بەپێی شێوازی بۆنەکانیش بەکاریهێناوە، لەم ڕووەوە گرنگە لە ڕێگەی مێژووی کۆمەڵایەتییەوە تیشک بخەینە سەر هەندێک لەو خشڵانە کە ژنی کورد بەکاری هێناون، کە جگە




لە مەبەستی خۆڕازاندنەوە بۆ چەندین مەبەستی دیکە بەکاریهێناون، وەک (ڕازاندنەوە و جوانکاری، هێمای ئایینی، جادووگەری، بەختی باش، چارەسەری نەخۆشی، پیشاندانی سامان، پێگە و دەسەڵات، پێگەی کۆمەڵایەتی ... تاد)٣). ڕەنگە لەو نموونانەی لێرەدا ئاماژەیان پێدەدەین، ناوەکان بەپێی ناوچەکان بگۆڕێن، یان خشڵێک لە ناوێک زیاتری هەبێت، ئەمەش ئاماژەیە بۆ دەوڵەمەندی زمان و فەرهەنگی کوردی.

## خشڵەکانی سەروبەست:

سەروبەست یان پێچانی سەر لە کەلتووری زۆربەی نەتەوەکاندا بۆ ژن و پیاو جێی بایەخ و کارپێکراو بووە، سەروبەست بۆ چەندین مەبەستی وەک پاراستن لە سەرما و گەرما و ڕێز و نەریتی ئایینی و دەرخستنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بەکارهاتووە، لەهەمانکاتدا ڕازاندنەوە یەکێک بوو لە مەبەستە هەرە گرنگەکان، لێرەدا مەبەستمانە باس لە سەروبەستی ژنانی کورد بکەین.

سەروبەست بەشێکی گرنگە لە کۆی پۆشاک و جلوبەرگی ژنانی کورد، بە چەندین شێواز بەستراوە و بە چەندین جۆر خشڵ و ئێکسسوار ڕازێندراوەتەوە، ئەو خشڵانەی کە ژنی کورد سەروبەستەکانیان پێڕازاندووەتەوە زۆرن و ناوی جیاجیایان لێنراوە، هەربۆیە ڕەنگە تاڕادەیەک جۆرێک لە ئاڵۆزی بۆ خوێنەر دروستبکات، چونکە ناو و بابەت و شێوازەکان زۆر لەیەکتر نزیکن.

کوردناس و ڕۆهەڵاتناسەکان کە سەردانی ئەم ناوچانەیان کردووە، بایەخی زۆریان بە لایەنی کەلتووری داوە، لەنێو پۆشاک و پێداویستییەکاندا سەروبەست بە هۆی جوانی و ڕازاوەییەوە بۆتە جیی تێڕامان و سەرنجیان، کە بە خشڵی تایبەت نەخشێنراون، لە کۆندا بە کڵاوی خانمان وتراوە فێست، کە بە سرکەیی یاخود چەفتەی گوڵنگەداری تێکەڵ بە سیمی ڕەنگ جیاواز پێچراوەتەوە، ئەو دیزاینەی فێستەکەی پێ ڕازێندراوەتەوە، هەر بە تەنیا نەبووەتە جێگای سەرنجی کوردناسان، بەڵکو شێوازی بەستن و وردییەکەی جۆرێک لە ئاڵۆزی لا دروستکردوون، بۆ نموونە میستەر ڕیچ دەڵێت: ‹‹سەرپێچی ژنی کورد ناتوانرێ بە وردی باسبکرێت››(٤). ژنان لە

کۆندا گرنگی بەرچاویان بە سەروبەست داوە، بە جۆرێک لەکاتی کارکردنی سەختیشدا بەردەوام سەروبەستیان لە سەردا بووە، تەنها لەکاتی خەودا لایان بردووە. ئەم پۆشاکە بە چەندین شێواز چووەتە ناو پەندی پێشینانەوە، لەو ڕووەوە وتراوە:››ژن بەسەروپۆڕ، پیاو بەجل و جۆڕ››(٥). دیاترین ئەو پارچە خشڵانەی کە سەروکڵاویان پێ ڕازێندراوەتەوە بریتیین لە:

**بەرچاوگە:**

دیارترین پارچەی ڕازاندنەوەیە بۆ بەشی پیشەوەی فێست بەکاردێت، زۆر کات بە زەنگیانە یاخود زێڕ یاخود موورووی شیلانە و هەندێک جاریش بە قوماش نەخێشنراوە(٦).

**گێلگێلە:**

هەندێک جار پێنج لیرەییەک یاخود چەند لیرەیەکی زیوو یان زێڕ بووە، لەگەڵ چەند ڕیزە مووروویەکی جوان و بەنرخ، کە هەندێکجار سێ ڕیز بووە، وەک چەپکە بە موورووی شین و شیلان و عەقیق بە تەوقە سەری کڵاوەکەدا دادووراوە، هەندێک جاریش مێخەکی تێکەڵکراوە لەگەڵ موورووی شیلانی بچووک، لە تەوقی سەری کڵاوەکەوە کەمێک شۆڕ کراوەتەوە، جوانییەکی تایبەتی بە فێستەکە بەخشیوە و لەگەڵ هەر جوڵە و هەڵسوکەوتێکی خانمەکەدا گێلگێلەکە دەنگ و جوڵەی تایبەتی دروستکردووە و نیگاکانی بردووە، هەر ئەمەش سەرنجی شاعیرانی ڕاکێشاوە و لە هۆنراوەکانیاندا ڕەنگدانەوەی هەبووە، هێمن موکریانی دەڵێت:

**«شل و مل و لەبارن چاوبەکل گوێ بە گوارن**

**دەسماڵ پوڵەکەدارن شەدە و گێلگێلە لارن››(٧)**

لێرەدا شاعیر وەسفێکی جوانی ئارایشت و خۆڕازاندنەوە و نازکی ژنی کورد دەکات، ورد شێوازی گێلگێلەکەمان پێدەڵێت کە بەلاری بەستوویەتی و هێندەی دی جوانی بەخشیوەتە سەروسیمای خاوەنەکەی.

**ژێرچەنە:**

یەکێکی دیکە لەو پارچە خشڵانەی کە سەرەڕای جوانی و ڕازاوەییەکەی لەهەمانکاتدا بۆ ڕاگیرکردنی کڵاوەکە بەکارهاتووە، چونکە بەبێ ژێرچەنە فێستەکە ناوەستێت، ژێرچەنە بە مورووی زەرد و سوور و شین دادەگیرایەوە، وتراوە کە ژێرچەنە لە ژێر چەناگەوە هاتووە(٨) و تایبەتمەندی دەدات بە کڵاوەکە و دەیڕازێنێتەوە، هەروەها دەبووە جێگەی سەرنج، چونکە جوانییەکی تایبەتی بە گەردنی ژنان دەبەخشی، هەربۆیە گەردن و ژێرچەنە ئیلهامبەخشی شاعیرانی کلاسیک بووە، زۆرن ئەو شاعیرانەی ژێرچەنەی فێستی ژنان مەستی کردوون کردوویانەتە هەوێن و سەرچاوەی لە دایکبوونی شیعری تەڕ و خەونی ڕەنگاڵەیی، قانعی شاعیر لە وەسفی ژێرچەنەدا وتوویەتی:

**ژێرچەنەی لەعل و عەقیق و ملەوانەی زێڕین**

**گۆ لەمل و دیدە بەکل، پەرچەمی ئاوداری هەیە››(٩)**

**لاگیرە:**

جۆرە خشڵێکە ژنان لەسەر سەروپێچەوە دەیدەن لە سەریان(١٠)، لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، لای ڕاست و لای چەپ، دوو قولاپی پێوە بوو، لە ڕازاندنەوەی لا تەنیشتی کڵاودا بەکاردەهات. زۆرجار وتراوە لاگیرەی پێچکە ئەشرەفی، یاخود پەهلەوی، لاگیرەش وەک هەریەکێک لە خشڵەکانی دیکە جێی پێداهەڵدانی شاعیران بووە، لە یەکێک لە بەیتە شیعریەکانیدا قانع باسی دەنگی لاگیرە دەکات و دەڵێت:››

**برقەی بەرچاو و زرنگەی کڵاوزەڕ**

**ئەگریجەی قرتاوە وەک ڕێحانەی تەڕ**

**ورشەی گوارەگوێ، زریکەی لاگیر**

**هاڕەی پڵپڵە و سڵسڵەی زنجیر››(١١)**

مەولەویش لە بەیتێکدا دەڵێت:

**سەدای (لاو هەی لاو) زڕەی زەڕ زەنجیر**

**سڵسڵەو بانی سەر، بەندزرێ و لاگیر(١٢)**

**کرمەک:**

کرمەک یاخود مووررووی کرمەکە، لە شێوەدا لە کرم دەچێت، بۆ ژێرچەنە و ڕازاندنەوەی کڵاو لە ژێرچەنەدا بەکاریانهێناوە، جوانی و ڕازاندنەوەیەکی سەرەکی بووە لە فێستەکانیاندا، هێمنی شاعیر لە شیعری شەنگەبێریدا باسی جوانی و دیمەنی شەنگەبێری کردووە لە کاتی مەڕدۆشیندا، کاتێک ئاوازی خشڵەکانی دەبێتە سەمفۆنیا و چاو و گوێی شاعیر پڕدەکات، دەڵێت:››

**شەنگەبێری!ساڵی ساڵان لە کوێستان، لەناو مەڕی**

**بۆ مەڕ دۆشین هەڵت دەکرد ئەو باسکی سپی مەڕمەڕی**

**لە بەر هاڕەی گۆبەرۆک و گوارە و کرمەک و ژێرچەنە**

**نیوەڕۆیە لەبەر بێری کۆڕی مەڕی ڕادەپەڕی››(١٣)**

**گوڵی لاسەر و گوڵی مەلیکی:**

دوو کەرەستەی جوانی ڕازاندنەوەی سەروبەست بوون، لە کۆندا گوڵی لاسەر دوو گوڵ بوون بە لای ڕاست و چەپی کڵاوەکانیاندا دایاندەدووری، هەروەها گوڵی مەلیکیش لە ئاڵتوون دروستکراوە، پلپڵەی پێوە بووە و ناوەکەی شووشە بووە، هاوشێوەی نقێمی ئێستا. گۆرانی شاعیریش لە هۆنراوی (جوانێ لە لادێ) لە وەسفی ئەو کیژۆڵەیەدا لەکاتی زەردەپەڕ و خۆرئاوابووندا، وێنای گەوهەرەکانی و سێبەر و ڕەنگدانەوەیان دەکات و دەڵێت:››

**چەن جوانی بەرەو مەغریب ئەچی زەردە ئەدا لێت،**

**پرشنگی خشڵ ئەبڵەق ئەکا دەوروبەری ڕێت،››(١٤)**

## خشڵەکانی ڕازاندنەوەی مل

**سمڵ**

کەم نین ئەو خشڵانەی کە ژنان بۆ ڕازاندنەوەی سنگ و بەرۆک و گەردن و بۆ بۆنخۆشکردنی خۆیان بەکاریان هێناوە، ڕەنگە زیادەڕەوی نەبێت ئەگەر بڵێین بەکارهێنانی سمڵ و مێخەک وەک دووانەیەکی دانەبڕاون لە ژیانی

ژناندا، هاوشێوەی ئاڵتون و زیوو ئامادەییەکی گرنگ و بەرچاویان هەبووە و بەردەوام لەناو کەلوپەلەکانی ژناندا بەکارهێنراون، هەرچەندە حەز و خولیای ژنان بۆ بەکارهێنانی خشڵ زۆر بەرفراوان بووە بەشێوەیەک لەکاتی بۆنە و میوانداریەکاندا زیاتر جێگەی سەرنج بووە، میس بێڵ دەڵێت: ‹‹کاتێک سەردانی ماڵی عەونی ئەفەندی بەڕێوبەری پێنجوێنم کرد و لە ماڵیاندا میوان بووم، هاوسەرەکەی عەونی ئەفەندی لە پێشوازی مندا بەتایبەتی هەموو خشڵ و زێڕێکی تایبەتی کردبوو بە خۆیدا››(١٥)

سمڵ ڕووەکێکی بۆنخۆشە لە وەرزی بەهاراندا لە نزیک ئاو گەشە دەکات، لە ئەوروپا و ئاسیا دەڕوێت، گوڵێکی بنەوشەیی مەیلە و پەمەیی و گوڵی سپی دەکات، باڵای ئەم ڕووەکە بەرز نییە، ڕەگەگەی شێوە خڕە، لە کۆندا ژنان بەمەبەستی بۆنخۆشکردنی خۆیان لەگەڵ مێخەکدا بەکاریانهێناوە، زۆرجاریش بە تەنها وەک ملوانکەی درێژ لەگەڵ پۆشینی جلوبەرگی کوردیدا بەکارهاتووە، لە ئارایشتکردن و ڕازاندنەوەی بووکیشدا بەکارهاتووە، سەرەرای بوونی بۆنە خۆشەکەی زۆر کاتیش وەک چارەسەر بۆ نەخۆشییە جیاوازەکان بەکارهاتووە(١٦)

گۆرانی شاعیر لە وەسفی ژنی هەوراماندا دەڵێت:‹‹

**ژنی هەورامان سەرتاپای خشڵ سەرچاوەی مێخەک و سمڵ**

**تا بلێی تەڕپۆش، ئاڵ و واڵا جل، بەژن و باڵا جوان، بەدەن نەرم و شل››(١٧)**

**مێخەک و مێخەکبەند**

بەشێکی زۆر لە سەرچاوەکان نیشتمانی ڕەسەنی گەشەکردنی داری مێخەک دەگەڕێننەوە بۆ وڵاتی ئەندۆنیسیا، بەڵام لە ئێستادا لە زۆربەی ناوچە جیاوازەکاندا بوونی هەیە، مێخەک تەنها بواری جوانکاری نەگرتووەتەوە، بەڵکو یەکێکە لە بەهاراتە گرنگەکان کە بەدرێژای چەندین سەدە وەک پارێزەری خۆراکی و سەرچاوەی تام و بۆن بەکارهاتووە(١٨)، لەهەمانکاتدا لە بواری پزیشکیشدا بەکارهاتووە، لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا لەلایەن ژنانی خاوەن ئەزموونەوە لە چارەسەرە سروشتییەکاندا گرنگی بەرچاوی پێدراوە.

لە بواری جوانکاریشدا مێخەک بۆتە تەلیسم و ڕەمزی ناسینەوەی ژنی

کورد، سەرەڕای جوانی و ڕازاوەییەکەی، بۆن و بەرامەیەکی خۆشی بەخشیوە بە دەوروبەر، ئەگەر خشڵەکانی دی بەپێی جیاوازی بۆنەکان بەکارهاتبن، ئەوا ئەوەی مێخەک جیادەکاتەوە لە خشڵەکانی دیکە، بەکارهێنانیەتی لە هەموو کاتە جیاوازەکاندا، تەنانەت زۆربەی کات بۆ نووستنیش دایان نەناوە، ئەگەر خشڵەکانی دیکە بەپێی مەراسیمەکان بەکارهێنانی گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت، بۆ نموونە لەکاتی پرسەدا ژنان هەندێک لە خشڵەکانی سەروپێچەکەیان (ڤێست) کەمکردووەتەوە، ئەم حاڵەتەش لە کوردەواریدا پێیوتراوە (کڵاو ڕەشکردنەوە)، وەک هاوخەمی و پرسەداریی، بەڵام مێخەکبەندەکەیان لانەبردووە، زۆربەی کاتیش مێخەک و سمڵ دووانەیەکی لێک دانەبڕاوبوون و بەیەکەوە بەکارهاتوون، وەک دوو دەستە خوشک بوون(١٩)

بە چەندین جۆر و شێوازی جیاجیا هۆنیویانەتەوە، زۆرجار بەپێی شێوازی ناوچەکان گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، جگە لەوەی وەک ملوانکە لە ملیانکردووە و پێیانوتووە مێخەکبەند، هاوکات زۆر کاتیش لەگەڵ سمڵدا بە دەرزییەک کردوویانە بە یەخەی هێلەك یاخود سەڵتەکانیانەوە، هەندێک جاریش ڕێحانەیان لەگەڵدا داناوە. هەرچەندە مێخەک چەندین هەزار ساڵە وەک بەهاراتێکی تایبەت بۆ ناو خواردن بەکارهێنراوە، بەڵام جیاواز لەوە ژنان لە بواری ڕازاندنەوەی خۆیاندا گرنگییەکی بەرچاویان پێداوە، هەمیشە وەک ملوانکە لە ملیاندا بووە، بەپێی ناوچە و سەردەمەکان بە چەندین شێواز هۆنراوەتەوە و بە ملوانکەی مێخەک وتراوە مێخەکبەند، هەندێک جاریش لەگەڵ سمڵدا بەکاریانهێناوە و کردوویانە بە جلەکانیانەوە(٢٠).

بەوهۆیەوە کە مێخەک و سمڵ بەردەوام هاوەڵی کچان بووە، هەربۆیە بۆتە پەڕلە و ئاماژەی نێوان دڵدار و دڵبەر، هەمیشە ئامادەی جێژووان بووە و شاهیدی ئاهـ و حەسرەتی یاران بووە، هەر بەو هۆیەوە مێخەک و سمڵ بوونەتە کەرەستەی شیعریی بۆ زۆر لە شاعیران و گۆرانیبێژان و کردوویانەتە سەربەندی ئاواز و سەدای میلۆدییەکان. گۆرانی شاعیر لە کۆپلەیەکدا دەڵێت:»

**بابێ بۆنی مەمەی**

**لە درزی سوخمەی**

بۆنی وەنەوشە، گوڵ
مێخەک، عەتر، سمڵ ...(٢١)

یان دەڵێت:

هەندێ کچ بێ تەجرەبە سووراو سپیاوی ئەوێ
مێخەک و عەتر و سێوی نەخشاوی ئەوێ(٢٢)

یان دەڵێت:

سەر جادە موعەتتەرکە بەبۆی خونچە و مێخەک،
بەو لەنجەیەوە بەستە بڵێیت ورشەی خامەک،
هاڕەی کەمەرە و گوارە و کرمەک (٢٣)

**حێلومێخەک:**

یەکێکی دی لەو خشڵە بایەخدارانەی کە وێڕای جوانییەکەی، لە کۆندا زۆرجار بە خشڵی خانەدانان ناوزەدکراوە، ئەویش حێلومێخەکە، کە لە شێوەدا ملوانکەیەکی درێژ بووە و بەردێکی گەورە بە ئەندازەی لەپی دەست لە ناوەڕاستیدا بووە، زیاتر لە بۆنە و ئاهەنگەکاندا بەکارهاتووە، یان لە جەژنەکان و لەکاتی سەیران و گەڕاندا، یەکێکیش بوو لەو خشڵانەی تایبەت بۆ بووک کراوە، چونکە لە نرخدا لە خشڵە بەها گرانەکان بووە(٢٤).

**گەردنلغ:**

خواستی ژنان بۆ بەکارهێنان خشڵ جیاواز و پڕ لە وردەکاریی بووە، یەکێک لەو خشڵانەی کە بەکارهاتووە گەردنلەغە، کە بۆ مل بەکاردەهات، نقێمێک لە ناوەڕاستەکەیدا بووە، دوو ڕیز بووە و لیرەی پێوە بووە(٢٥).

**بەراقە:**

(بەراقە)ش هاوشێوەی ملوانکەیەکی درێژبووە و بەسەر سنگدا شۆڕبووەتەوە، لە شێوەی زنجیرێکی درێژکۆلەدا بووە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێکی زۆر ئەڵقەی بەیەکداچوو، لەبەر درێژییەکەی زیاتر بە دوو بەش کراوەتە مل، واتە بە دوولۆنی، لە هەندێک شوێنیش بە دوولۆنە ناوبراوە(٢٦).

**گەردانە:**

شێخ محەمەدی خاڵ لە فەرهەنگی خاڵدا وتویەتی مەبەست لە گەردانە ملوانکەیەکی زێڕینی پڵپڵەدارە، ژنان دەیکەنە ملیان(٢٧). زیاتر لەلایەن ژنانی گەنجەوە بەکارهاتووە، ئەو ژنانەی کە تەمەنیان هەبووە کەمتر بەکاریان هێناوە، زۆرجار ناوی گەردانە و پەروانە بەیەکەوە هاتووە(٢٨).

**لوولەوزنجیر:**

خشڵێکی کۆنی کوردەوارییە و لەلایەن ژنانەوە گرنگی زۆری پێدراوە، بۆ چەندین مەبەستی جیاواز و جوانکاری بەکارهاتووە، لە کۆندا لوولەوزنجیر زۆر باو بووە، نێوانی لوولەکان لیرەی پێوە بووە، زۆرجار دوعای چاوەزاری تێکراوە، یان کەسێک کە منداڵی بۆ نەماوە یان ژنێک منداڵی لە باربچوایە، دوعاکەی دەکردە لوولەکەوە(٢٩).

خڕخاڵ مەچەکی چەشنی سەهۆڵی

ملوێنک لە مل لوولە لەسەر دڵ

چاو پڕ لە غەمزە، ڕوومەت تۆپی گوڵ(٣٠)

**حەمایل**

حەمایل یان حەمایڵ یەکێکە لە خشڵە دێرینەکان، بەشێوەی ڕاست و چەپ بەکارهێنراوە، ڕەنگە ناوەکەی لە وشەی (حمائیل)ی عەرەبییەوە هاتبێت، کە بە مانای هەڵگری شمشێر دێت و حەمایلیش هاوشێوەی ئەو ڕاست و چەپ لە شان و مل کراوە.

حەمایل لە شێوەدا پەتێکی چنراوی درێژ بووە، لەگەڵ پارچەیەک قوماشی شێوە چوارگۆشەییدا، وەک گیرفان یان جزدانێکی بچووک دروستکراوە، کە لە ناوەڕاستی پەتەکەدا بووە، چەند دەنکە موروویەکی پێوە بووە و کراوەتە سەر پەتەکە، زۆرجار مێخەک یان سمڵ بۆ بۆنخۆشی کراوەتە نێوان دەنکە مورووەکانەوە. بەشێوەی ڕاست و چەپ لەژێر یان سەر سەڵتە و هێلەك لە مل کراوە، بەڵام لەگەڵ کەوادا کەوتووەتە سەر کەواکە ئەگەر دەسماڵ یاخود جەفتەیان پۆشی بێت بەسەر کەواکەدا، ئەوا لەوکاتەدا کەوتووەتە سەر کەواکە،

لەبەرئەوەی دەسماڵ یاخود چەفتەکە تەنک بووە، ئەوا حەمایلەکە دەردەکەوت، سەرەڕای ئەوەی وەک خشڵێکی جوانکاری بەکارهاتووە، لەهەمانکاتدا پارەی وردەی تێدا هەڵگیراوە و وەک جزدان بەکارهاتووە، هەروەها بۆ هەڵگرتنی دوعا و نوشتە بەکارهاتووە، کاتێک ژن دەگەیشتە کاتی منداڵبوون، هەبوو دەیانکردە ملی بۆئەوەی زووتر منداڵەکەی ببێت، هەروەها دەیاندا بەو ژنانەی کە تازە منداڵیان دەبوو هەتا چلەی دەچوو، زۆرجاریش سمڵ و مێخەک تێکراوە و بەردەوام بۆنی خۆشی بە چاوەدەوردا پەخشکردووە.(٣١)

## خشڵەکانی ڕازاندنەوەی هێلەك و سەڵتە

### چەقالە و گۆبەرۆک:

وردەکاری خۆڕازاندنەوەی ژنان تەنها لە سەروبەست و شێوازە جیاوازەکانی ملوانکە و زێڕ و زیودا نەوەستاوە، بەڵکو گەیشتووەتە ئاستێک پۆشاکەکانیشیان بە خشڵ ڕازاندووەتەوە، چەقالە و گۆبەرۆگ ئەو خشڵە سەرنجڕاکێشە بوون کە بۆ ڕازاندنەوەی کەناری هێلەك بەکارهاتووە و گرنگییەکی زۆری پێدراوە، بە تەقەڵ بە قەراغی هێلەکەکە یان سەڵتەکەدا دادرواوە، جاران بەو چەقالە لێدانە بە کەناری هێلەك یان سەڵتەدا وتراوە پێداگرتن لەجیاتی دروومان بەکارهاتووە(٣٢). گۆبەرۆک یان لە هەردوو کەناری پێشەوەی هێلکەکە دراوە یان بە پارچە پشت و پێشی هێلەکەکەی گرتووەتەوە، لەو کاتەشدا پێیوتراوە گۆبەرۆکی قەپات، واتە هەموو قەراغەکانی.

### دوگمەودۆڵاب:

بۆ بەستنی هەردوو لای هێلەك یاخود سەڵتە لە بەشی خوارەوەیدا بەکارهاتووە، جگەلەوەی جوانییەکی تایبەتی بە هێلەک یاخود سەڵتەکە دەبەخشی، لەهەمانکاتدا بۆ کاتی کارکردن جۆرێک لە کۆکردنەوەی بە جلەکان دەبەخشی، زۆرکاتیش ئەگەر هێلەك یان سەڵتە تاک گۆبەرۆگ یان چەقالەی پێوەبووایە تەواوکارییەکی جوانی لە نێوان جلەکان و خشڵەکاندا دروست دەکرد.

شێوازی پێوەکردنی دوگمەدۆڵابەکە بە چەند تەقەڵێکی دەرزی بە بەشی خوارەوەیدا دادەدورا، دوگمەودۆڵاب وەک هەریەکێک لە خشڵەکانی دیکە سەرچاوەی ئیلهامبەخشی شاعیران بووە، گۆرانییە فۆلکۆرییەکانیش لەمە بەدەر نەبوون، هەندێک جاریش لە جێگەی دوگمەودۆڵاب پلپڵەی زێڕ یاخود زیویان پێوەکردووە، هەمان جوانی و ئیشی دوگمەودۆڵابەکەی کردووە، لە بەندێکی فۆلکلۆریدا وتراوە:

**دوگمەودۆڵابی بانی سوخمەی ئاڵ**

**بووە بە پەرژین بۆ جوتێ پرتەقاڵ(٣٣)**

## کەمەر ڕازاندنەوە

**هەیاسە:**

بەشێکی دیکەی جەستە کە ژنان گرنگیان پێداوە و پەنجەی ڕازاندنەوەیان لێخسۆتە کار و ویستوویانە سەرتاپای لەشولار و قەدوباڵایانی پێبکەنە کەڤاڵێکی ڕازاوەی هونەریی کەمەرە، بۆ ئەم بەشەش چەندین جۆر پشتوێن و کەمەربەند و ئێکسسواری ڕازاندنەوەیان بەکارهێناوە. هەیاسە یەکێکە لەو بابەتانە. هەیاسە خشڵێکی دێرینە، جۆرە پشتێنێک بووە کە لە زیو دروست دەکرا، ژنان لە بۆنە جیاوازەکاندا لەسەر پۆشاکی کوردییەوە دەیانبەست، لە شێوەدا بەشی پێشەوەی لەسەر کەمەر بووە و دوو گۆی خڕی گەورەی بە ئەندازەی سێوێک پێوە بووە، هەردوو کۆتاییەکەی بە ئەڵقە بەیەکەوە بەستراوە و بەو ئەڵقەیە داخراوە، هەیاسە لە ڕستێک ئەڵقەی زنجیردراوی زیو دروستکراوە و هەندێک متومورووشی پێوە بووە(٣٤)، بە دەنگی ئەم خشڵە وتراوە هاڕە لە کاتی جوڵە و هەڵپەڕکێ و ڕۆیشتندا دەنگێکی تایبەت و جیاواز و سەرنجکێشی هەبووە، ئەم پشتێنە لەڕووی نرخەوە گران بووە، ژنانی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو توانیویانە بیکڕن. هەیاسەش وەک زۆربەی خشڵەکانی ژنان، جێی تێڕامان و هەستبزوینی شاعیران بووە و زۆرترین

شیعری بەسەردا وتراوە، بەختیار زێوەر لە وەسفی دەنگی هەیاسەدا وتوویەتی:

**بەتیلەی چاوان جەرگم زامارە**

**بەلارولەنجە دڵ پڕ هاوارە**

**خڕەی هەیاسە، زڕەی کەمەرە**

**بۆ دڵی (فایەق) چەرخ و چەمەرە(٣٥)**

گۆرانی شاعیر سەرەڕێی کانی لە دولبەرەکەی دەگرێت و تاسەی دووریی و تامەزرۆیی بینینی یار لە هەستی شاعیرانەیدا دەتوێنێتەوە و دەڵێت:

ئەڕۆی بە عیشوە، بە لەنجە، بە وەزنی گۆرانی

ئەڕۆی ... زڕەی کەمەرەت دێ هاتاکو بەرکانی!(٣٦)

هەروەها لە بەیتێکی دیکەدا وەسفی سەدای هەیاسەی کیژێک دەکات کە لە کانی دەگەڕێتەوە و بەعیشوە و نازەوە گڕ بەردەداتە ئاهی لاوان و حەسرەتی ساردیان دەداتە بەر زەردەی ئێوارە و دەڵێت:

**ئێواران پۆل پۆل لاوی کاکۆڵ لوول**

**سەرەڕێ ئەگرن، سەرگەرم و عەجول**

**هەرچەن هاڕەی دێ هەیاسەی جوانێک**

**لە هێلانەی دەم ئەفڕێ ئامانێک(٣٧)**

لە دێڕێکی دیکەدا گۆران جیاوازتر وەسفی هەیاسە دەکات و دیمەنی ناو زەماوەندێکی کوردەواری لە تابلۆیەکدا دەکێشت و دەڵێت:

**گوڵ بە ئاهەنگی ئامان لەرزۆکە پێیە دابنێ و پێیە بەرزۆکە!**

**بە ناز لار بگرە سەری بێ پووشین با بریقەی بێت کڵاو زەڕی چین چین!**

**پێچەکەی پشتەسەر لەسەر زوڵفی ڕەش با بجریوێنێ وەک ئەستێرەی گەش!**

**شانی بۆ شل کە و خۆت هەڵشێنەوە، سوخمەی سەر مەمک بلەرێنەوە:**

**با پێچەکەی نقێم گورج گورج بەتاسەوە لێو بنیتە سەر کوڵمی هەیاسە!(٣٨)**

**کەمەرە، قوبە، کەمەربەندی زیو، لیرە**

چەندین شێوەی دیکەی پشتوێن هەیە، کە دیارترینیان پشتوێنی کەمەرەیە، زیاتر لە زیو دروستکراوە و لە شێوەدا پان بووە، کە بە شێوەکەیدا قورس دەرکەوتووە، هەروەها پشتێنی قوبە هەبووە کە قورس و گەورە بووە، چونکە قوبەکەی گەورە بووە، لەهەمانکاتدا کەمەربەندی زیو کە لەشێوەدا پان بووە، پێشتنی لیرەش هەبووە. ناوی زۆرینەی خشڵەکان لە پەندی پێشیناندا هاتووە و بە چەندین مەبەستی جیاواز باسکراوە، بۆ نموونە پەندێک هەیە دەڵێت: ‹‹کەمەرە و لوولە هارەی دێ، سک لە برسا قۆڕەی دێ››(٣٩). هەندێک پشتوێنیش هەبووە هەر لە قوماش دروستکراوە و لە چەند ناوچەیەکی جیاواز بەکارهاتووە، هەر ناوچەیەش بەپێی تایبەتمەندیی و ئارەزووی خۆیان دروستیانکردووە و بەستوویانە.

**بازنگ یان بازن:**

بازنگ وەک خشڵێکی کۆن و بایەخدار بەلای ژنانەوە باسک و مەچەکیان پێ ڕازاندووەتەوە، چەندین جۆری جیاوازی هەبووە و هەریەکەیان ناوی تایبەت بە خۆی هەبووە، لەوانە: بازنەی لیرە، بازنگی مانگ و ڕۆژ، بازنگی گۆش، ئەکرایە دەست بە لاستیک و مووروو دەگیرایەوە و بەشێوەی گۆ بوو، بۆیە پێیوتراوە دەستەگۆ، لەهەمانکاتدا بازنگی گۆ هەبوو گۆکانی بەزنجیر بەیەکەوە دەنووسان، بازنگی دەبابە، بازنگی لیرە ... تاد و چەندین ناو و جۆری دیکە(٤٠). هێمنی شاعیر لە چەند بەیتێکی جیاوازدا جوانی بازنگ زیاتر دەباتەوە ناو دێڕەکانییەوە

لە چەندین شوێندا وەسفی کابانی ناوماڵ دەکات لەکاتی کارکردندا، کە دەنگی بازنەکانی دێت و بێدەنگی پێ دەهەژێنێت:

**چ خۆشە خرمەکەی خڕخاڵ و بازن و ژێرچەنەی کابان**

**چ خۆشە نەغمەکەی بلوێر، چ خۆشە لاوک و حەیران!(٤١)**

هەروەها لە تێکستێکی تردا وەسفی کابان و شەنگەبێری دەکات:

**کابانی قۆڵ بە بازن شەنگەبیری کێل گەردن**

**لەنێو مەڕ دێن و دەچن وەک پۆلی بۆ ڕان ڕان دەچن(٤٢)**

شاعیر بەوەندە ناوەستێت و زیاتر ڕۆدەچێتەوە ناو وردەکاری جوانییەکانەوە، باس لە سەدای دەنگی شمشاڵ دەکات و ئاوێزانی زرینگەی بازنگی کابانی دەکات، کاتێک کە مەشکەی گەورە (گاوس) دەژەنێت، دەڵێت:

**ئاهەنگی ژین و شادی بوو بەیانی کە تێکەڵ دەبوو**

**شمشاڵی من، خرمەی بازن، گرم و هۆڕی مەشکەی گاوس(٤٣)**

مستیلە، ئەنگوستیلە:

ژنان لە کۆندا جگە لەوەی خەنەیان بۆ ڕازاندنەوەی دەست و قامک و نینۆکەکانیان بەکاردەهێنا، مستیلەش ئێکسسوارێکی زۆر بەکارهێنراو بووە، کە لە هەندێک ناوچەدا پێشی وتراوە کلکەوانە(٤٤)، مستیلە تەواوکاری ئەو جوانییە دەست و پەنجەی خانمان بوو، پەندی پێشینانیش لە زۆر شوێندا ئاماژەی بە خشڵەکان داوە، لە ناویشیاندا مستیلە یەکێکە لەو خشڵانەی زۆر ناوی هاتووە، لە یەکێک لە پەندەکاندا سەبارەت بەوەی کە ژنان زوو لەشت بێزار دەبن، وتراوە: ‹‹ژن بێزار ئەبێ لە ئەنگوستیلە، بێزاری لە مێرد لەسەر دەلیلە››(٤٥)

لە کۆندا چەندین جۆر و شێوەی جیاوازی مستیلە هەبووە، بەگشتی مستیلەکانی کۆن ناوەڕاستەکەی نقێم یان مورووی عەقیق یاخود مورووی تانە لەسەر بوو(٤٦)، هەروەها مستیلەی پیرۆزەیی ناوەکەی نقێمێکی شین بوو، مستیلەی دووگۆ لە شێوەدا دوو گۆ بوون بە تەنیشتی یەکەوە، هەروەها جۆرێک مستیلەی چارەکە لیرەش هەبووە(٤٧).

**گوارە:**

گوارە وەک جوانکارییەکی سادە و بەردەوام لەلایەن ژنانەوە بەکارهاتووە، چەندن ناو و شێوازی جیاجیای هەبووە و بەپێی سەردەمەکان گۆڕاوە، لەوانە: گوارەی یاقوتی ئاڵ، خڕ و درێژیشی هەبووە، کە مێژووی بەکارهێنانی زۆر کۆنە، هەورووەها گوارەی سێ گۆ کە ئاڵتوون بووە و لە سێ گۆ پێکهاتووە. گوارەی (صباح الخیر)، کە لە شێوەی تۆڕێکدا چنراوە، گوارەی چەقالە، گوارەی چارەکە لیرەی درێژ، گوارەی کوپەیی، کە هاوشێوەی کوپە بووە ... تاد(٤٨).

شاعیران بە چەندین شێوەی جیاواز باسیان لەم خشڵەی ژنان کردووە، لەوانە قانعی شاعیر لە چەندین وێنای شیعریدا گوارەی کردووەتە وەسفی جوانیی و شیعرەکانی پێڕازاندووەتەوە:

**هەر ئەڵێ بەخوا کراسی سوور نەبێ نایکەمە بەر**

**ژێرچەناخە و کرمەک و گوارە و کلی چاوی ئەوێ(٤٩)**

یان دەڵێت:

**بێ قەتار و گوار، چەناخ و سڵسڵە شەوقی چیە؟**

**داری لیمۆ هەر کچە، بێ مەمکە کوڕ داری بییە!(٥٠)**

**لووتەوانە:**

ئەڵقە یان سنگێکی زێڕ یان زیوە، ژنان دەیکەنە لوتیان(٥١) و هەر لەمنداڵییەوە یان کە کچان گەورەبوون لووتیان بۆ سمیوە، سمینی لووت هاوشێوەی سمینی گوێچکەیە و لە نەرمایی لووتدا کونێکیان کردووە هەتاکوو لووتەوانەی تێبکەن. لە کۆندا زیاتر نقێمێکی شین و سێ پڵپڵەی پێوە بووە، یاخود تەنها نقێمێکی شین بووە، بەشی سەرەوەی ئاڵتوون بووە و پێیوتراوە خەزێم. خاتوو هینی ئاماژەی بەم خشڵە کردووە، لە لووتی هەندێک ژندا بینوویەتی بەلایەوە سەرنجڕاکێش بووە(٥٢).

**پاوانە**

پاوانە یاخود خڕخاڵیشی پێوتراوە، بەڕێژەیەکی کەمتر بەکارهاتووە، چەندین شێوەی جیاواز و ناوی جۆراوجۆری هەبووە، وەک گژنیژە کە لە شێوەدا ورد بووە هەروەک گژنیژ، هەروەها پاوانەی گۆ، هەندێک جاریش بەزەنگیانەی شین دروستکراوە(٥٢).

**مووروووەکان**

مورووەکان لە بنەڕەتدا وەک تەواوکاری خشڵەکانن و زۆرجاریش دەوترێت بەبێ یەکدی ناتەواون و جوانی پێویست نابەخشن، بۆیە هەریەکەیان جوانی و ڕەنگینی ئەویتریان تەواو دەکات و پێکەوە دەبنە تابلۆیەکی ڕەنگینی ڕازاندنەوەی ژنان، وێڕای جوانەکەیان و جیاوازتر لە خشڵەکانی دیکە زۆربەی مورووەکان

بۆ چەندین مەبەستی جیاواز و تایبەت لەلاین ژنانەوە بەکارهاتووە، وەک خۆپارێزیی و چاوەزار، یاخود بەمەبەستی تەندرووستی و چارەسەری کێشەکانی ژنان و چەندین گرفتی دیکە، ئەم زانیارییانەش نەوە لە دوای نەوە لەلایەن ژنانی بەتەمەن و خاوەن ئەزموونەوە بۆ نەوەی نوێ گوازاوەتەوە و جێگەی بایەخیان بووە.

بەشی هەرە زۆری مووروووەکان لە کۆندا لە بەردە گرانبەهاکان دروستکراوە، چونکە ئەوکات هێشتا پیشەسازی مووررووی دەستکرد گەشەی نەکردبوو، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی حەز و خولیای بەردی گرانبەها کۆکردنەوە لەناو کورددا کەمتر بووە و ئەو بەردانەی ناسرابوون لەنێو گەلانی دەوروپشتەوە هاتوونەتە نێو کەلتووری کوردییەوە. ناوی مووروووەکان بەپێی ناوچەکان گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە. ئەگەرچی ژمارەیان زۆرە، بەڵام وەک پێویست ئاوڕیان لێی نەراوەتەوە و توێژینەوە مێژووییەکان لە دەرەوەی ئەم بابەتانە دەستکورت بوون. لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێک لە مووروووانە باس بکەین کە لە کوردەواریدا ناسرابوون و بۆ جوانکاری بەکارهاتوون:

**مووروی تانە:**

یەکێک بووە لەو مووروووە جیاواز و تایبەتانەی کە لەلایەن ژنانەوە بەمەبەستی خۆڕازاندنەوە بەکارهێنراوە، ئاوێتەیەک بووە لە چەند ڕەنگێکی جیاواز و زیاتر بە لای سپیدا دەڕۆیشت، بەڵام لەناو یەک ڕەنگدا، جگە لە جوانکاری بۆ چارەسەری لێڵبوونی بینین بەکارهاتووە، لە بەرد دروستکراوە و ساڵانە حاجییەکان لە حەج هێناویانە.

**موررووی شەوە:**

ئەم جۆرە موررووە ڕەنگی ڕەش بووە، بەشێوەیەکی گشتی زیاتر شێوەی لاکێشەیی و خڕ بووە، ژنی زەیستان لە ملی دەکرد و بەدەرزیش دەدرا لەسەر شانی منداڵەکە، بۆئەوەی شەوە دەستی لێنەوەشێنێت، زیاتر ئەو ژنانە بەکاریاندەهێنا کە لەو بڕوایەدا بوون جنۆکە لە ماڵەکەیاندا هەیە.

موورووی هەنگوینی:

ئەم جۆرە مووروە زیاتر ڕەنگاوڕەنگ و خڕبوو، بۆ بووک بەکاردەهات، ڕەنگە هەر بەوهۆیەشەوە ناونرابێت هەنگوینی، هەروەها ژنانی بەتەمەن بۆ ڕازاندنەوەی کۆڵوانەکانیان بەکاریاندەهێنا، زۆرجاریش دەکرا بە ملوانەیەکی (مله پڕە).

**مووروی شیلانە:**

یەکێکی دیکە لەو جۆرە موورووانەی کە لە کوردەواریدا لەلایەن ژنانەوە گرنگیەکی بەرچاوی پێدراوە موورووی شیلانەیە، کە لە هاڕاوەی مەرجان دروستکراوە و لە کۆندا بۆ ڕازاندنەوەی کڵاو بەکارهاتووە، ڕەنگی سوور و سەوز بووە، لەهەمانکاتدا وەک ملوانەکە و خشڵە جیاوازەکانی سەر جلی کوردی ژنان خۆیان پێڕازاندووەتەوە.

**موورووی زەردوو:**

وێڕای بەکارهێنانی لە بواری خۆڕازاندنەوەدا، لەهەمانکاتدا بە مەبەستی چارەسەریش بەکارهاتووە، کاتێک منداڵ تووشی زەردوویی بووە کراوەتە دەست یان ملی، زۆرجاریش بە دەرزییەک کراوە بە جلەکانییەوە.

**موورووی زاڵە:**

ئەم مووروە لە بنەڕەتدا لەبەرد دروست دەکرێت، ژنان زیاتر بۆ ملیان بەکاریان هێناوە، وێڕای خۆڕازاندنەوە هاوشێوەی موورووەکانی دیکە بۆ چارەسەریش بەکارهاتووە، کاتێک کەسێک ئازاری زراوی هەبووبێت ئەم موورووەی وەک چارەسەر و ئارامکەرەوەیەک بۆ ئازارەکەی بەکارهێناوە.

**مووروی کارەبا:**

زۆرجار کراوە بە تەسبیح، بەهۆی جوانی ڕەنگ و دەنکەکانییەوە وەک ملوانکە و دەستبەند بەکارهاتووە.

**موورووی شیری:**

سەرەڕای جوانییەکەی، کاتیک ژنێک تازە منداڵی ببوایە دەیکردە دەست یاخود ملی بۆئەوەی شیری هەبێت، ڕەنگێکی شیریی ئاوێزان بە ڕەنگەکانی

دیکەی هەبوو، مورووویەکی جوان و قەبارەی لە مورووەکانی دیکە گەورەتر بوو، هەربۆیە بە زۆری لە نێوانی چەند مورووویکدا دەکرا بە ملوانکە و لە ملی دایکی شیردەر دەکرا.

**مورووی گۆشگرە:**

لە شێوەدا هاوشێوەی گوێچکەماسی بوو، ڕەنگی سپییە و پەڵەی ڕەش یان زەردی تێدا بوو، بە درێژی دەکرایە مل، شیلانی سوور و سەوز و شین دەکرایە نێوانی، پێنج تمەنی تاکە، یان دوو قەرانی دەکرایە ناوەڕاستی ملوانکەکە و بەشێوەی درێژ لە مل دەکرا(٥٣).

قوڵبوونەوە و وردبوونەوە لەنێو بابەتە کەلتووریی و شێوازەکانی ژیانی ڕۆژانە، دیسان دەمانباتەوە سەر ڕێچکە نوێیەکەی دووبارە نووسینەوە مێژوو، هەتا دوور لە مێژووی کەسایەتی و سیاسییەکان، شۆڕبینەوە بەنێو مێژووی کۆمەڵایەتیدا، ئینجا بۆمان دەردەکەوێت، ئەوەی لە بەناو تۆمارە مێژووییەکاندا بە ئێمە گەیشتووە، بەشێکی زۆر کەم و پڕە لە پەراوێزخراوی بەمەبەست، ئەوەی بە ئێمە گەیشتووە دیوە ناشرینەکەی مێژووە، تۆماری دڕندەییەکانی مرۆڤە، بەڵام لەملاشەوە مێژوویەکی پڕ جوانی شاردراوەتەوە، ئەرکی هەمووانە دەستبخەینە سەر برینەکانی مێژوو هەتا ڕاستییەکان دووبارە بگەشێنەوە.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


1. https://search.app/RMZHvDiH4ZAR9VMr5
2. https://search.app/w6gLyderzwFZp8fcA
3. https://search.app/CaUDm6Ajr1jfHuqq5

٤-کلاودیوس جەیمس ڕیچ، گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و. محەمەد حەمەباقی، ب١، چ١، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ٢٠١٢، ل٢٩٥.

٥-دێدەوان یەعقوبی، ژنناسی لە پەندی پێشیناندا، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر ، ٢٠٠٧، ل ٦.

٦- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا (تەمەن ٧٧ ساڵ)، سلێمانی، ٩-٩-٢٠٢٤.

٧-هێمن موکریانی، سەرجەم و کۆی شیعر و پەخشانی مامۆستا هێمن موکریانی، چ٢، چاپخانەی بڵاوکراوەی کوردستان ، سنە، ل ١٢٤

٨-هەژار، هەمبانە بۆرینە (فرهنگ کردی- فارسی)، یک جلدی، چ١، ١٣٦٩، چاپخانە بویا چاپ و در صحافی، فرد صحافی شد ، ص٤٠٢.

٩- قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥، کۆکردنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، ١٩٩٨، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژ، سنە، ل٢٤٠.

١٠- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، چ١، چاپخانەی، دەزگای ئاراس، ٢٠٢١، ل٤٢٢.

١١-قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥، کۆکردنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، ١٨٩٨، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژ،سنە، ل٢٣٤.

١٢-مەولەوی، دیوانی مەولەوی ،(کۆکردنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس)، چ٤، بڵاوکردنەوەی کوردستان ، سنە،ل ٤٢٠

١٣-هێمن موکریانی، سەرجەم، ل ١٦١

١٤-گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی محەمەدی مەلا کەریم، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردستان و چوارچرا، سنە، ل٧٢.

١٥-میس بێڵ، کورد لە نامەکانی میس بێڵدا، و: محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق، چاپخانەی تاران، ٢٠١٦، ل١٣٢.

١٦-ڕاز ئەسعەد، جوانکارییەکانی ژنی کورد، گ(سلێمانی)، ژ ٧و٨ ، ٢٠٢٤، سلێمانی، ل٤٦.

١٧- گۆران ، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی، ل١٦٦.

18. https://pmc.ncbi.nlm.nih.gov/articles/PMC3819475/

١٩-چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو ڕەحمە محەمەد شەریف(تەمەن ٨٨ ساڵ)، سلێمانی ، ١٠-١٠-٢٠٢٤.

٢٠-ڕاز ئەسعەد، جوانکارییەکانی، ل٤٦.

٢١- گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی،ل٥٨.

٢٢- قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥، کۆکردنەوەی، ل٤٦٧.

٢٣- گۆران، دیوانی گۆران (کۆکردنەوەی ....، ل٧٢.
٢٤- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا......
٢٥- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا....
٢٦- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو ڕەحمە محەمەد....
٢٧- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، ل٤١٠.
٢٨- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحولڵا......
٢٩- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو ڕەحمە محمەد....
٣٠-قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥، کۆکردنەوەی، ل٢٣٤.
٣١- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عیسمەت ئەحمەد(تەمەن ٩٥ ساڵ)، ٨-١٢-٢٠٢٤.
٣٢- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عیسمەت ئەحمەد.
٣٣- مامۆستا محەمەد باقی سەعید بەرزنجی، گوزەرانی دانیشتوانی شاری سلێمانی لە پێش ساڵانی (١٩٤٠) تا نزیک پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، چ١، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٢٤، ل٢٣٦.
٣٤-چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو ڕەحمە محەمەد....
٣٥-بەختیار زێوەر، دیوانی زێوەر، کۆکردنەوەی مەحمەد زێوەر، چ٣، ٢٠٠٨، ل ٦٦.
٣٦- گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی، ل١٠٠.
٣٧- گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی .....،ل١٦٥.
٣٨- گۆران، دیوانی گۆران (کۆکردنەوەی .....،ل١٨٧.
٣٩-شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، دەزگای ئاراس، ٢٠٢١، ل ٢٤١.
٤٠- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو ڕەحمە محەمەد..
٤١- هێمن موکریانی، سەرجەم، ل٩٤.
٤٢- هێمن موکریانی، سەرجەم، ل ١٢٥.
٤٣- هێمن موکریانی، سەرجەم، ل١٦٢.
٤٤- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا......
٤٥-صدیق اورحمان علی و ثریا احمد عبدالله، مجلة الأستاذ للعوم الإنسانیة والأجتماعیة، العدد الخاص بالمؤتمر العلمی السابع، لسنة ٢٠١٩، ص ٤٤٨.
٤٦-چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو نازدار سالح تەمەن ٧٥ ساڵ، سلێمانی، ٣١-٧-٢٠٢٤.
٤٧- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا......
٤٨- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خاتوو عەتیە فەتحوڵڵا......
٤٩- قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥-، کۆکردنەوەی، ل٤٦٨.
٥٠- قانع، دیوانی قانع ١٩٦٥-، کۆکردنەوەی، ل١٥٤.
٥١- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، ل٤٢٨.
٥٢-بەدر خان سندی، کۆمەڵگای کوردەواری لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسیدا، و: د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید، چ١، چاپخانەی خانی، دهۆک، ل٤٩١.
٥٣- ڕاز ئەسعەد، جوانکارییەکانی ژنی کورد.




**دانا ئەسعەد**

ماستەر لە ڕاگەیاندن و پەیوەندییە گشتییەکان


# ساختەهەواڵ..

## مەترسییەکانی و چۆنیەتی ناسینەوەی



## دەسپێك:

ساختەهەواڵ (فەیکنیوز) کە هەواڵ و زانیاری دروستکراو و شێوێنراوە، یەکێکە لە دیاردە بەربڵاوەکانی ناو سۆشیالمیدیا و جیهانی گەیاندن، لەم ساڵانەی دواییشدا شانبەشانی پێشکەوتنی ئامراز و تەکنەلۆجیای میدیا ئەویش زیاتر بەرەو هەڵکشان و بڵاوبوونەوە ڕۆیشتووە و بووەتە مەترسییەکی جدی لەسەر ژیانی خەڵك و دۆخی میدیا، ئەم بابەتە هەوڵێکە بۆ هەڵوێستەکردن لەسەر دیاردەکە و مەترسییەکانی و میکانیزمەکانی ناسینەوەی.

## چەمك و پێناسەی ساختەهەواڵ (فەیکنیوز):

تێکچڕژان و تێکەڵی زۆر هەیە لە نێوان هەواڵی ساختە و هەواڵی ناڕاست و هەواڵی درۆ یان پڕوپاگەندە، بۆ دیاریکردن و جیاکردنەوەی ئەمانەش گرنگە ئەوە دیاری بکرێت کە ساختەهەواڵ لەبنەڕەتدا هەواڵ نییە ( Academy DW,٢٠١٩). شارەزایان پێیانوایە دوو جۆر هەواڵی فەیک هەیە، جۆری یەکەم ئەوەیە کە هەواڵەکە ناڕوون و ناڕاستە و بە ئانقەست دەیەوێت بۆ مەبەستی سیاسی یان ئابووری خوێنەر بەلاڕێدا ببات و چەواشەی بکات، نووسەری هەواڵەکە خۆی دەزانێت کە هەڵەیە، بەڵام بەمەبەست بڵاوی دەکاتەوە، بەڵام جۆری دووەم ئەوەیە کە هەواڵەکە کەموکورتی تێدایە، مەبەستی هەواڵەکە ئەوە نییە وەرگر بەلاڕێدا ببات، بەڵکو کەموکورتییەکەی ئەوەیە زانیاری تەواوی دەستنەکەوتووە و بە وردی سەیری بەڵگەنامەکانی نەکردووە، جاری واش هەیە هەواڵەکە بنەمای ڕاستی تێدایە، بەڵام لە ڕادەبەدەر گەورە کراوە ( BBC,٢٠٢٠).

پەیمانگای ئۆکسفۆرد بۆ زانستەکانی کۆمپیوتەر زاراوەی «زبڵ _ junk» بۆ هەواڵ و زانیاری ناڕاست بەکاردەهێنێت و سەرچاوەکەشی پەیوەست دەکات بە مینبەرەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە زەمینەی ئەم دیاردەیە دەڕەخسێنن و دیاردەکەش کاریگەری نەرێنی لەسەر تێگەیشتنی خەڵك دادەنێت بۆ ڕاستی و متمانەیان لاواز دەکات (الیونسکو، ٢٠٢٠، ٣١). ساختەهەواڵ بە چەکی ئەوانەش دادەنرێت کە بێدەسەڵات و بێتوانان لە کاردانەوە یان ڕەفتاری پێویست لە جێگەی پێویست و ناچار پەنا بۆ دروستکردنی هەواڵی درۆ دەبەن (dw.com).

فەرهەنگی کۆلینز (Collins Dictionary) زاراوەی ساختەهەواڵ بەزانیاری ناڕاست یان هەڵە دەناسێنێت کە لەژێر ناونیشانی هەواڵ و وەك زانیاری دروست دەرخواردی خەڵك دەدرێت، مەرجیش نییە ئەو هەواڵە دروستکراو و ساختەیە تەنها لە سۆشیال میدیا بڵاوبکرێتەوە، دەکرێت لە میدیای تەقلیدی بێت .

دەکرێت ساختەهەواڵ بەو چیرۆکە هەواڵیانەش بوترێت کە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، یان ئەو زانیارییە هەڵانەی بۆ پارە دروست دەکرێن و پەخش دەکرێن، یان ئەو زانیارییانەی لە شکڵدا لە هەواڵ دەچن، بەڵام لە ڕێکخستن و ئامانجدا جیاوازن (C.Silverman ٢٠١٧).

سەرجەم پێناسەکانیش لەوەدا هاوڕان و یەکدەگرنەوە کە ساختەهەواڵ دوو کۆڵەکەی بنەڕەتیی تێدایە، ئەوانیش نیازی پێشوەختی دروستکردن و لەخۆگرتنی زۆرترین شتی ناڕاست یان خاڵی بوونە لە هەر ڕاستییەك لەناو هەواڵەکە، چونکە لە بنەڕەتەوە هەڵبەستراوە (بهنسي، ٢٠١٩، ٥٦٦)، هۆکاری سەرەکی بڵاوکردنەوەشی مەرج نییە تەنها سۆشیال میدیا بێت، بەڵکو دەکرێت ڕاگەیاندن و میدیای تەقلیدی بێت، بەڵام لە سۆشیال میدیادا زەقتر بڵاودەکرێتەوە.

هەندێك لە کۆمەڵناسان باس لەوە دەکەن لە نێوان دەنگۆ و ساختەهەواڵ لەگەڵ متمانەدا پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە، بەجۆرێك تا ئاستی متمانەی گشتی لەناو کۆمەڵگادا بەرزتر بێت ئەوا بازاڕی دەنگۆ و ساختەهەواڵ لاوازە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بە هەر هۆکارێک ئاستی متمانەی گشتی لەناو کۆمەڵگایەکدا لاواز بێت، بازاڕی دەنگۆ و ساختەهەواڵ برەوەی زیاتری هەیە (ئیسنا، ٢٠٢٠).

لەبارەی جۆرەکانی ساختەهەواڵیشەوە، توێژینەوەکان زۆر خاڵ و تەوەریان دیاری کردووە وەك: گاڵتەجاڕی و لاقرتێ و تێکەڵکردنی لەگەڵ هەواڵ، لایەنگریی زۆر و چڕ، تیۆری پلانگێڕیی و پەیوەستکردنی ڕووداوەکان بەئەجێندا و ئامانجی دیاریکراوی پێشوەخت، دەنگۆ، پیشەکردنی زانست و زانیاریی ساختە، هەواڵی ڕقاوی و چەواشەکار لەگەڵ جەختکردنەوە لەیەك دید و بۆچوونی دیاریکراو کە هاوسەنگی تێدا نەبێت (بهنسي، ٢٠١٩، ٥٦٨_٥٦٩).

## سەرهەڵدان و پەرەسەندنی ساختەهەواڵ

لەبارەی مێژووی سەرهەڵدانی فەیك نیوزیشەوە، بۆچوونی جیاجیا هەن، بەڵام ئەوە یەکلایە هەزاران ساڵە بڵاوکردنەوەی زانیاریی و هەواڵی درۆ و ساختە وەک پیلانێک بۆ سەرکەوتن و لەچوارچێوەی جەنگی دەروونیدا بەکارهاتووە، گایۆس ئۆکتاڤیۆس تۆرینۆس، یەکەمین ئیمپراتۆری ڕۆم لە دوایین شەڕی لەگەڵ ڕکابەرەکەی مارکۆس ئانتۆنیۆس، هەڵمەتێکی بەربڵاوی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری هەڵە لە دژی ڕکابەرەکەی پیادەی کردووە، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا هەواڵ و زانیاری درۆ بەڵام پۆزەتیڤی لەبارەی خۆیەوە بڵاودەکردەوە، ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ سەرکەوتن بەسەر مارکۆسدا (٢٠١٨، ڕادیو زمانە)، بەم پێیەش دروستکردنی هەواڵی ناڕاست هاوتای سەرهەڵدانی چەمکی هەواڵ خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی هۆکارەکانی گەیاندندا ئەویش پەرەسەندنی زیاتری بەخۆیەوە دیوە، بۆ نموونە لە سەدەی نۆزدەیەم «ڕۆژنامەوانی زەرد» سەریهەڵدا کە لەسەر قەبەکردنی هەواڵ و گەورەکردن و زیادەڕۆییکردن تێیدا یان هەوڵی شێواندن کاری دەکرد لەبەر هەندێ بەرژەوەندی تایبەت. بەرلەوەی زاراوەی «فەیك نیوز» بەچڕوپڕی سەرهەڵبدات (aljazeera.net, ٢٠٢٠) بەتایبەت پاش هەڵبژاردنی دۆناڵد ترەمپ لە ٢٠١٦ بۆ سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە توێژەران سەردەمەکەی بەهاندەری ڕق و قین و تەنگەتاوکردنی ئازادی ڕۆژنامەگەری دەدەنە قەڵەم، بەدوای ئەوەشدا دەرچوونی بەریتانیا لە یەکێتی ئەورووپا و هەندێک ڕووداوی تری وەك ڕاپرسی سەربەخۆیی کەتالۆنیا (al maaref cs.org,2018).

بەپێی توێژینەوەیەکی زانکۆی ستانفۆرد، لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ٢٠١٦ ی ئەمریکادا ئەو وێبسایتانەی هەواڵی فەیکیان بڵاوکردووەتەوە ١٥٠ ملیۆن سەردانکەریان هەبووە، هەروەها لە ماوەی کەمپینەکانی هەڵبژارندا ئەو هەواڵانەی کە زۆرترین جار لەلایەن خەڵکەوە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان شەیر کراون هەواڵی فەیک بوون. بۆ نموونە ئەم چەند هەواڵە فەیکە لەوانەن کە زۆرترین شەیر کراون: (پاپای ڤاتیکان پشتگیری خۆی بۆ ترەمپ ڕاگەیاند)، (هیلاری کلینتۆن چەکی بە داعش فرۆشتووە)، (ئەو بەرپرسەی ئێف بی ئای کە گومانی لێ دەکرا ئیمەیلەکانی هیلاری ئاشکرا کردووە کوژرا) ( تێلیگراف، ٢٠١٨).

## مەترسییەکانی ساختەهەواڵ:

مەترسی ساختەهەواڵ لەوکاتەوە زیاتر زەقبووەتەوە، کە هۆکارەکانی گەیاندن زۆر زیاتر لە جاران پەرەیان سەندووە و بەخێرایی و ساناتر لە جاران وەرگر و خوێنەر هەواڵ و زانیارییەکانیان پێ دەگات، لە سایەی ئەم دۆخەشدا زۆر قورسە بۆ وەرگر هەواڵی ڕاست و ناڕاست لە یەکتر جیا بکەنەوە، ئەمەش مایەی نیگەرانییە تەنانەت بۆ بەرپرسانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان (اليونسكو، ٢٠٢٠، ص ٣١).

ئەم دۆخەی کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دروستیانکردووە زادەی کۆمەڵێك گۆڕانکاریی و پێشهاتە لەوانە: قەیرانی متمانە لە نێوان خەڵك و سیاسییەکان و نەبوونی زەمینەی هاوبەش بۆ بیرکردنەوە و لێکگەیشتنیان R.Nielsenn& L.Graves) (٢٠١٧) گواستنەوە لە ژینگەی سەدەی بیستەمەوە کە میدیای تەقلیدی باڵی بەسەردا کێشابوو بۆ ژینگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە دەرفەتی شێرکردنی زانیاری بە ئاسانی دەڕەخسێنن بێ ئەوەی بە هیچ فلتەر و پشتڕاستکردنەوەیەکدا بڕوات (H.Alcott & M.Gentzkow, 2017 Vol.31, p.215)

هەندێک بۆچوونی تر هۆکاری پەرەسەندنی ساختەهەواڵ دەگێڕنەوە بۆئەوەی کە خوێنەران، پشت ناونیشانەکان ناخوێننەوە و شێری دەکەن، ئەم حاڵەتەش لە هەندێ توێژینەوەدا بەڕێژەی ٥٩٪ لەسەر بەکارهێنەرانی تویتەر تێبینی کراوە. هەندێ توێژینەوەش تەنها سۆشیالمیدیا بە بەرپرس نازانن لە تەشەنەکردنی ساختەهەواڵ چونکە ماڵپەڕ و ئامرازی تری پەخشکردنی هەواڵی جارێکیتر ئەو هەواڵە ساختانەی ناو سۆشیالمیدیا لە ڕێگای تایبەتی خۆیانەوە بڵاودەکەنەوە (بهنسي، ٢٠١٩، ٥٦٦).

سەرباری ئەمەش ڕاستییەك هەیە کە بەر لە سەردەمی ئینتەرنێت بڵاوکردنەوەی زانیاریی و هەواڵ تێچوویەکی زۆری هەبوو، میدیایەک بۆئەوەی متمانەی جەماوەر بەدەستبهێنێت ساڵانێک کارکردنی پێویست بوو، ڕۆژنامەوانی و کاری میدیایی پێناسە و چوارچێوەیەکی ڕوون و دیاریکراوی هەبوو، بەوهۆیەشەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری درۆ بە تایبەت لە وڵاتانی ئازاد کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە میدیا ڕکەبەرەکان بە ئاسانی دەیانتوانی هەواڵ و زانیارییە درۆ و

ساختەکان بۆ جەماوەر ئاشکرا بکەن، بەوشێوەیە میدیاکان لەپێناو پاراستنی متمانەی جەماوەر بە ئاسانی پەنایان نەدەبردە بەر فەیک نیوز، بەڵام بە هاتنی ئینتەرنێت و سەرهەڵدانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، لە وڵاتانی دیموکراسی و ئازاد هەموو بەربەستەکانی بەردەم ساختەهەواڵ تێکشکان و هەمووکەس دەرفەتی بۆ ڕەخسا کە هەواڵ بڵاوبکاتەوە (تەلیگراف، ٢٠١٨). س

## تەشەنەکردنی ساختەهەواڵ:

شارەزایان پێیانوایە، باوەڕکردن بە هەواڵ و زانیارییەکی ساختە دەبێتە هۆی ئەوەی بە خێرایی ئەو هەواڵە ساختەیە لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوببێتەوە، لەهەمانکاتیشدا دژایەتیکردنیشی هەر دەبێتە هۆی خێرا بڵاوبوونەوەی. بەو واتایەی ئەگەر بێتو متمانە بە زانیارییە ساختەکە بکەین ئەوا بەوپێیەی باوەڕمان پێیەتی بۆ خەڵکی دیکەی دەگوازینەوە، بەڵام ئەگەر دژیشی بوەستینەوە، دیسانەکە بۆئەوەی بۆ خەڵکی ڕوونبکەینەوە کە ئەم هەواڵە ساختە و ناڕاستە، دیسانەکە پەرەمان بە بڵاوکردنەوەی داوە، ئەو کاتە ئەوە خەڵکن کە هەواڵە ساختەکەیان بەدەستگەیشتووە بەپێی باوەڕی پێشووی خۆیان بڕیار دەدەن کە متمانە بە هەواڵەکە بکەن یان دژی بووەستنەوە، نەک ڕوونکردنەوەی لایەنێک یان ئەو کەسانەی کە دژی هەواڵەکەن. ( ٢٠٢٠، ایسنا).

بەگوێرەی توێژینەوەیەکیش کە پەیمانگای ماساچوستێس بۆ تەکنەلۆجیا ئامادەی کردووە لە ٢٠١٨، بڵاوبوونەوەی هەواڵی ساختە زۆر خێراترە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تا هەواڵە ڕاستەکان، ئەمەش بەهۆی توانای زۆری ساختەهەواڵ لە دروستکردنی ترس و تۆقاندن و واق وڕمان لای وەرگر و خوێنەران، ئەمەش وایان لێ دەکات شێری بکەن لەگەڵ خەڵکی تر بەتایبەت لەسەر سۆشیالمیدیا کە سنور ناناسێت (aljazeera.net, 2020).

بەپێی توێژینەوەیەک کە یەکێتی ئەوروپا بودجەی بۆ تەرخانکردووە و ئامانجی توێژینەوەکەش ئەوەبووە کە وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە سەرباری نالۆژیکی بوون و ناڕاستبوونی زانیارییەکانی هەواڵی فەیک بۆچی خەڵک متمانە بەو زانیارییانە دەکەن؟ لە توێژینەوەکەدا پشت بە زانستی

(Neuroscience) بەستراوە کە شیکاری بۆ چۆنیەتی کارکردنی مێشکی مرۆڤ دەکات، ئەوەمان پێدەڵێت کە زانیاریی و داتا دووبارەکراوەکان هەموو جارێک لە شوێنکی تایبەتدا لە مێشکی مرۆڤدا جێ دەگرێت و لەڕێی هەندێک خانە و بە هەندێک دەماری دیاریکراودا هاتووچۆ دەکات، بەواتەیەکی دیکە ئەگەر مێشکی مرۆڤ وەک شارێکی پڕ لە جادە و شەقام و کۆڵان سەیر بکەین، ئەو زانیارییانەی کە لەگەڵ بیروباوەڕی پێشوومان یەکدەگرنەوە، بەخێرایی لەڕێی ئۆتۆبان و شارێگەکانەوە دەگاتە شوێنی مەبەست و مێشکی مرۆڤ بە خێرایی زانیارییەکە وەردەگرێت، بەڵام ئەو زانیارییانەی کە نوێن و لەگەڵ بیروباوەڕەکانمان یەکناگرنەوە بە کۆڵان و لاڕێگەدا هاتوچۆ دەکەن و لە شوێنێکی پەراوێزی ناو مێشکدا جێ دەگرن و هەر بە زوویش لەبیر دەکرێن. بەوپێیەی مرۆڤ بوونەوەرێکی سەرسەخت و پێداگرە و بە ئاسانی واز لە بیروباوەڕەکانی ناهێنێت، هەر ئەم تایبەتمەندییەش وا دەکات کە ئەو زانیارییە نوێیانە بە ئاسانی وەرنەگرێت کە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی نەگونجێن، لە بەرانبەردا بە ئاسانی ئەو زانیارییانە وەردەگرێت کە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی دەگونجێت، ئەمەش دەرفەت بۆ ئەوە دروست دەکات کە بە ئاسانی متمانە بەو هەواڵ و زانیارییە ساختانە بکات کە لەگەڵ باوەرەکانی دەگونجێت (٢٠٢٠، مشرق نیوز).

هەروەها زۆر بەڵگەی سەلمێنراوی تر هەیە کە بەراورد بە هەواڵی ڕاست، ساختەهەواڵ زۆر خێراتر و لە ئاستێکی بەربڵاوتردا لەناو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە، بۆ نموونە، بەپێی توێژینەوەیەکی ئێم ئای تی، ١٪ بەهێزترین هەواڵە فەیکەکان لە نێوان هەزار بۆ ١٠٠ هەزار کەس بڵاودەبێتەوە، بەڵام بۆ هەواڵە ڕاستەکان ئەم ڕێژەیە بە ئاستەم هەزار کەس تێدەپەڕێنێت (knowledge4policy.ec.europa.eu ،٢٠٢٠). جگەلەوەش ساختەهەواڵ هەڵگری چێژ و سەرسوڕمان و شتی ناباوە، بەڵام ڕاستییەکان سادە یان زانراون، ساختەهەواڵ تایبەتمەندییەکی تریشی هەیە بەخێرایی دزە دەکات و تەشەنە دەکات و هیچ پشکنین و سۆراغکردنێکی پێویست نییە (Academy DW ).

## ڤیدیۆی ساختە (دیپ فەیک)

دیپ فەیک، جۆرێکی نوێ و پێشکەوتووی فەیک نیوزە و پشتڕاستکردنەوەی ڕاستی و درۆیەکی کارێکی ئاسان نییە، دیپ فەیک دروستکردنی زانیاری فەیکە لەڕێی ڤیدیۆوە لەڕێی تەکنەلۆژیایەکی زۆر پێشکەوتووی زیرەکەوە (dubai post.ae,2020).

مێژووی دروستکردنی ئەم تەکنیکەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠١٤ کە توێژەرێکی بەناوبانگی بواری سیستمی زیرەک، سیستمێکی زیرەکی دروستکرد کە کورتکراوەکەی بریتییە لە سیستمی GAN، کە بۆ کارکردن بوو لەسەر وێنە و ڤیدیۆ و ئامانجیش لە دروستکردنی ئەم سیستمە بەکارهێنانی بوو لە بەرهەمهێنانی فیلم و یاری کۆمپیوتەری و فاشیۆن، بەڵام زۆری نەخایاند ئەم سیستمەیان لە پیشەسازی پۆرنۆگرافیدا بەکارهێنا. ئەمەش بیرۆکەی ئەوەی لای هەندێک کەس دروستکرد کە ئەم سیستمە زیرەکە لە دروستکردنی وێنە و ڤیدیۆی فەیکدا بەکاربهێنن و یەکەمجار وێنە و ڤیدیۆی هەندێک کەسی ناسراو و بەناوبانگیان خستە سەر وێنە و ڤیدیۆی ئەکتەرەکانی پۆڕن کە تەنانەت کەسانی زۆر شارەزاش نەیانتوانی بیسەلمێنن کە ئەمە فەیک و درۆیە. بەم جۆرە ژانرێکی نوێ لە فەیک نیوزدا دروستبوو بەناوی دیپ فەیک (دۆویچە ولە، ٢٠١٩).

دیپ فەيك لە ڕێگەی ئەپڵیکەیشنێکەوە بەردەستە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەناوی «Reddit» لەسەر پێگەیەك كە هەڵگری ناوی « deepfakes»، لەم سیستمەدا زۆر بە ئاسانی دەکرێت سەری کەسێک یان ئەندامانی جەستەی کەسێک بخرێتەسەر جەستەی کەسێکی دیکە و هەر جوڵە و ڕەفتارێک بیانەوێت بەو کەسەی دەکەن. ئەم سیستمە کار لەسەر دەنگیش بە هەمان دیقەت و وردی دەکات، هەندێک قسە دەخەنە سەر زمانی کەسێکەوە کە ئەو کەسە هەرگیز ئەو قسانەی نەکردووە و تەنانەت هەرگیز ئەو وشانەشی بەکارنەهێناوە. دیارترین نمونەی دیپ فەیک ئەو ڤیدیۆیە بوو کە بۆ باراک ئۆبامای سەرۆکی پێشووی ئەمریکا دروستکرابوو، کە تیایدا لە پەیامێکدا دەڵێت سەرۆک ترەمپ کەسێکی گەمژەیە، ئەم ڤیدیۆیە ئەوەندە بە وردەکارییەوە دروستکراوە کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ڤیدیۆ ڕاستەقینەکانی پێشووی ئۆبامادا نییە (arageek.com, ٢٠٢٠)؛ (dubaipost.ae,٢٠٢٠).

شارەزایان باس لەوە دەکەن، دیپ فەيك ئاستی تەحەداکان بۆ بینەر و وەرگر زۆر بەرزدەکاتەوە و ئەوە دەکاتە ئەرك بەسەرمانەوە کە بڕوا بە هەمووشت نەکەین،

تەنانەت ئەگەر ڤیدیۆش بێت، چونکە ساختەکاری تەنها لە بواری فۆتۆشۆپدا نییە و خۆی گەیاندووەتە ئەم بوارەش (towardsdatascience.com, ٢٠١٨)، لە چەند ساڵی ڕابردووشدا ئەم تەکنیکە بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکارهاتووە بۆ شێواندنی ناوبانگی ژنان و دروستکردنی تۆمەتی ئەخلاقی بۆ کەسە دیارەکان و دروستکردنی کەیس بۆیان (arageek.com, ٢٠٢٠).

زۆربەی شارەزایان هاوڕان کە دیپ فەیک مەترسییەکی جدییە بۆ سەر سیاسەت و ئاسایش. مەترسییەکەش لەوە دەستپێدەکات کە کەس و لایەنی نەیار مەبەستی بێت بۆ تۆڵەکردنەوە و سوککردنی سیاسییەک ڤیدیۆیەک دروستبکات کە ئەو سیاسییە تیایدا هەندێک زانیاری نهێنی یان لێدوانی مەترسیدار بدات و بەمەش بە ئاسانی ڕای گشتی چەواشە بکەن (al-ain.com, ٢٠١٩). بە بۆچوونی شارەزایان مەترسییەکە هەر لەوەدا کورت نابێتەوە، بەڵکو مەترسییەکی گەورەی دیکەش ئەوەیە کە ڤیدیۆی دیپ فەیک دەبێتە هۆی نەمانی متمانەی گشتی، بە جۆرێک ڕایگشتی ئەگەر ڤیدیۆیەکی ڕاستەقینەش ببینین باوەڕ ناکەن بە ڕاستییەکە و وەک دیپ فەیک سەیری دەکەن.

لە ئێستادا وەزارەتی بەرگری ئەمریکا دەیان ملیۆن دۆلار بودجەی تەرخانکردووە بۆئەوەی سیستمێک دروستبکات بۆ پشتڕاستکردنەوەی دیپ فەیک و جیاکردنەوەی ڤیدیۆی فەیک لە ڤیدیۆی ڕاست، هەروەها کۆمپانیاکانی فەیسبوک و گوگڵیش بە جیا سەرقاڵی توێژینەوەی لەسەر دروستکردنی سیستمێک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردەی دیپ فەیک. هاوکات ئاژانسی ڕۆیتەرز لەڕێی سیستمێکەوە بەناوی فەکتن چێکێر هەوڵدەدات بۆ پشتڕاستکردنەوەی ڤیدیۆ و وێنەی دیپ فەیک، بەڵام بەرپرسی بەشی یو جی سی (پشتڕاستکردنەوەی یو جی سی ڕۆیتەرز) دەڵێت: ئەو دیپ فەیکانەی بەشێوەیەکی پڕۆفیشناڵ دروستکراون تەنانەت کەسانی زۆر پڕۆفیشناڵ و بە ئەزموونی بواری تەکنەلۆژیاش بە هەڵەدا دەبەن ( ٢٠١٩، دۆویچە ولە).

## ڕێوشوێنەکانی ئاشکراکردنی ساختەهەواڵ

ناکرێت میدیاکار یان خوێنەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە سەرچاوەیەکی گرنگی دەستخستنی زانیارین پشتگوێ بخات، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانێت کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان سەرچاوەیەکی بەرفروانی ساختەهەواڵن و زۆرجار ڕۆژنامەنووسی تەنانەت بە ئەزموونیش کەوتوونەتە تەڵەی ئەو زانیارییە

فەیکانەی کە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە بە مەبەست یان بەبێ مەبەست بڵاوکراونەتەوە. لەلای خۆیەوە کۆمپانیای فەیسبوک کۆمەڵێك ڕێکاری ڕاگەیاندووە بۆ جیاکردنەوەی هەواڵی ڕاست لە فەیک کە ئەمانەی خوارەوەن (alarabiya,2020)؛ (dw.com,2018):

یەکەم: سەرنجدان لە مانشێتی هەواڵەکان، ئەو مانشێتانەی زۆر سەرنجڕاکێشن و نیشانەی پرسیار یان سەرسوڕمانیان هەیە، ئەوە بە ئەگەری زۆر فەیکن.

دووەم: تەماشاکردنی لینکی وێبسایتەکان، ئەو وێبسایتانەی هەواڵی فەیک بڵاودەکەنەوە زیاتر ناو و نیشانی نزیک لە ماڵپەڕ و ئاژانسە گرنگ و متمانەپێکراوەکان بەکاردەهێنن، وەک ئێس ئێن ئێن کە نزیکە لە سی ئێن ئێن ... تاد.

سێیەم: گرنگیدان بە سەرچاوەی هەواڵ، ئەگەر سەرچاوەکە کەس یان لایەنێکی خۆشناو و باوەڕپێکراو نەبوو، یان لە وێبسایتێک وەرگیرابوو کە ناسراو نەبوو، ئەوە گومان لە دروستییەکەی بکەن.

چوارەم: سەیری ڕێنووس و ڕێزمانی هەواڵەکە بکەن، زۆربەی هەواڵە فەیکەکان پڕن لە هەڵەی ڕێنووس و ڕێزمان.

پێنجەم: سەرنجدان لە وێنەکان، بەشێک لە هەواڵ و ڕاپۆرتە فەیکەکان دەستکاری وێنە بنەڕەتییەکان دەکەن.

شەشەم: تەماشاکردنی بەروار و ڕێککەوتەکان، لە هەواڵە ساختەکاندا زۆرجار ڕێکەوتی سەیر و سەمەرە و بێ واتا دادەنرێت کە یەکناگرێتەوە لەگەڵ کاتی ڕووداوەکە.

حەوتەم: تەماشاکردنی بەڵگەکان، ئەو بەڵگانەی کە ناوی نووسەرەکەی تێدا هاتووە، نەبوونی هیچ سەرچاوەیەک یان نەبوونی ناوی نووسەر یان نەناسراوبوونی نووسەرەکە دەتوانێت بەڵگە بێت بۆ فەیکبوونی هەواڵەکە.

هەشتەم: سەرنجدان لە شوێنی بڵاوبوونەوەی، ئایا هەواڵە لە هیچ شوێنێکی دیکەی متمانەپێکراو بڵاوبووەتەوە یان نا؟ ئەگەر لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاونەبووبێتەوە دەکرێت بەڵگەبێت بۆ فەیکبوونی هەواڵەکە.

# سەرچاوەکان


- اليونسكو (٢٠٢٠)، الصحافة والأخبار الزائفة والتضليل،الأردن.

- ٢٠١٨، تێلێگراف، جەیمز کارسۆن، وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی فارسی لەلایەن جویا ئاروین، بڵاکراوە لەلایەن ڕادیۆی زمانە، ٣٩٣t٥٨v/https://bit.ly (سەردان: ٢٠٢١/١/١٣)

- ٢٠١٩، دۆویچە ولە، دیپ فیک، وقتیکە بە چشمانمان هم نمی توانیم اعتماد کنیم، https://bit.ly/390oMe7 (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٠)

- ٢٠٢٠، ایسنا، اخباری کە زندگی آدمها ڕا نابود می کنند، https://bit.ly/35TjsqY (12/1/2024 :سەردان)

- ٢٠٢٠، بی بی سی، ٣c٠r٢nM/https://bbc.in (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٣)

- أكاديمية دوتشي فيليه Academy DW ))، الأخبار الزائفة والتربية الإعلامية والمعلوماتية، تجارب المغرب وتونس والجزائر، ٢٠١٩، (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٢)

- https://bit.ly/3oZAb3m مشرق نیوز، ٢٠٢٠، چی چیزی باعث می شود اخبار جعلی ڕا باور کنیم؟ (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٥)

٢٠٢٠، knowledge4policy.ec.europa.eu، https://bit.ly/3bWCJLV (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٣)

- https://al-ain.com/article/deepfake-ai-trust (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٠)

- https://towardsdatascience.com/why-deepfakes-are-a-good-thing-10ceb86deaed (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٥)

- https://www.alarabiya.net/ar/technology/2017/04/07/10-%D9 (سەردان: ٢٠٢٤/١/١١)

- https://www.aljazeera.net/blogs/2020/5/24/%D9%85%D8%B3%D8%A7%D8%B1- (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٠)

- https://www.aljazeera.net/news/international/2018/4/2 /%D8%A8%D9 %8A%D9% (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٢)

- https://www.almaarefcs.org/4685/275 (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٣)

- https://www.amnesty.org/ar/latest/news/2020/05/in-a-post-covid19-world-fake-news-laws-a-new-blow-to-freedom-of-expression-in-algeria-and-morocco-western-sahara/ (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٥)

- https://www.dubaipost.ae/ar/short-n-easy/useful-and-inspiring/2020-10-12-1.7964 (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٠)

- https://www.dw.com/ar/%D8%A7%D9%83%D8%B0%D8%A8- (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٢)

- https://www.dw.com/ar/%D9%81%D9%8A%D8%B3%D8%A8%D (سەردان: ٢٠٢٤/١/١٣)

# ناساندنێکی کتێبی

## ئایینزای ئەشعەری لەناو کورددا

**ئا: خاڵ**

- ئایینزای ئەشعەری لە ناو کوردد
- نووسەر: د. یاسین تەها محەمەد
- **بڵاوکار:** خاڵ بۆ هزر و ڕۆشنبیریی
- نۆبەو ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٤






ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا تێزی دکتۆرایە و بە پلەی «نایاب» لە گفتوگۆدا لە «زانستە مرۆڤایەتییەکانی» زانکۆی سلێمانی وەرگیراوە. کارەکەش لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی - شیکارییە لە بارەی گەشەسەندنی ئایینزای ئەشعەری لە پانتایی کوردیدا و پەیوەندی بە ڕێبازە ئایینییەکانی ترەوە لە نێوان سەدەی ٤-٨ک/١٠-١٤ز، کە بە «سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی» دەناسرێت. لەم کارەدا هەوڵدراوە بە بەکارهێنانی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی کەلێن و نادیاری زۆر لە ڕاستییە مێژووییەکانی پەیوەست بە مێژووی عەقیدە پڕ بکرێنەوە، بەهۆی ئەوەشی زۆر لە زاراوە عەقیدەیی و شەرعزانییەکان هێشتا هاوتا و بەرانبەریان لە زمانی کوردیدا بۆ دانەتاشراوە ناچار لە توێژینەوەکەدا بە زمانی عەرەبی دانراونەتەوە یان هاوتای کوردییان بۆ دانراوە.

بەپێی پێناسەکانی توێژینەوەکە «ئەشعەری، ئایینزایەکی عەقیدەیی کەلامیی سوننەی بەربڵاوە، لە سەدەی (٤ک/١٠ز) لە بەغداد سەریهەڵداوە و دواتر قۆناغ بە قۆناغ بە زۆر ناوچەی جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاوا پەلیهاویشتووە». هەروەها «ئەم ڕێبازە هەوڵدەدات لێکدانەوەی عەقڵ و واتا ڕووکەشەکانی دەق پێکەوە بگونجێنێت، پشت بە لێکدانەوە و دواتریش فەلسەفە دەبەستێت بۆ تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامی و سیفەتەکانی خودا».

توێژەر ئەوەی خستووەتەڕوو کە بنکۆڵکارییەکە «هەوڵێکە بۆ دەرخستنی پەرەسەندنەکانی مێژووی عەقیدەی ئیسلامی لە ناوچە کوردنشینەکانی بندەستی خەلافەتی عەباسی، هەروەها سۆراغی ئەوەش دەکات چۆن و بۆچی لە سەدەکانی نێوەڕاستی ئیسلامیدا شافیعییە ئەشعەرییەکان لە پانتایی کوردیدا زۆر و باڵادەستبوون لەکاتێکدا پێشتر بەرکەوتەی زۆریان لەگەڵ خەواریجەکان و دواتر مەزهەبە فیقهییەکاندا هەبووە. هەروەها تیشکدەخاتە سەر پەیوەندیی شەرعزانانی کورد و نیشتەجێی ناوچەکانی ژیانکردنی بە گەورە ڕێبەرانی ئەشعەریی و لەهەمانکاتیشدا مەزهەبە عەقیدەییە دژبەرەکانی ئەم ڕێبازەوە، کە شوێنکەوتووانی واتا ئاشکراکانی نەقڵن (سەلەفییە حەنبەلییەکان).

بەپێی ئەنجامگیرییەکانی ئەم تێزە زانکۆییە هەتا سەدەی (٨ک/١٤ز)

ئایینزای ئەشعەری لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیی ئەوکات باڵادەستترین تەوژمی ناو بەرەی سوننە بووە، یەکێك لەو پانتاییە جوگرافیی و مرۆییانەیشی تێیدا بڵاوبووەتەوە و کاریگەری لە سەر داناوە، ناوچە کوردنشینەکان و شەرعزانەکانی نیشتەجێی ئەم ناوچانە بووە، بەجۆرێك زۆربەیان بوونەتە بەشێك لە بانگخوازانی ئەشعەری، بەتایبەت کە لە مشتومڕ و دەمەقاڵێ هزریی و عەقیدەییەکاندا لە سەدەکانی ناوەڕاستی جیهانی ئیسلامیدا سنوورێکی جیاکەرەوە نەبووە، دەستەبژێرەکان بەیەکتر کاریگەربوون و لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاوا گەشتوگەڕانیان کردووە و ئەرکیان پێسپێردراوە و کاری وانەبێژیی و فەتوادان و دادوەرییان کردووە، ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر ناوچەکانی نیشتەجێبوونی کورد هەبووە کە بریتین لە: جزیرە، ئەرمینیە، ئەزەربیجان، چیا، شارەزوور، هەولێر لەگەڵ ناوچەکانی نیشتەجێبوونی ئەیوبییەکان و هۆزە کوردییەکانی لە هەردوو وڵاتی شام و میسر بەتایبەت کە ئایینزای ئەشعەرییان بووە بە بیروباوەڕی فەرمی دەوڵەتی ئەیوبی و هەموو تواناکانی دەوڵەت خراوەتە خزمەت بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانییەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی شیعە ئیسماعیلییە باتنییەکان.

## ناوەڕۆك و بەشەکان:

توێژینەوەکەی، کە لە شێوەی کتێبدا چاپکراوە لە چوار بەش پێکدێت کە ناوەڕۆکەکانیان بەم جۆرەی خوارەوەیە:

بەشی یەکەم: باسی ڕەوشی مەزهەبی و ئایینی لەناو کورد، بەر لە بڵاوبوونەوەی ئایینزای ئەشعەری دەکات. لەم بەشەدا تیشکخراوەتەسەر بیری خەواریج و شیعە لە ناوچە کوردنشینەکان بەوپێیەی دوو لە دێرینترین گرووپەکانی ئیسلامن، هەردووکیشیان لە هەناوی شەڕی «صفین» دەرکەوتوون (٣٧ك)، لێکەوتەشیان لەسەر ناوچە کوردییەکان هەبووە و شوێنکەوتە و هەواداری خۆیان لە چینی حوکمڕان و خەڵکە ئاساییەکەش هەبووە، دواتر چوار مەزهەبە فیقهییە بڵاوەکەی سوننە (حەنەفی، مالیکی، شافیعی، حەنبەلی) جێگەیان دەگرنەوە. هەروەها باس لە بڵاوبوونەوەی سۆفیگەریی و ڕەوتە هاوشێوەکانی کراوە

لەنێو کورددا، کە شێوازێکە لە ئیسلامی کۆمەڵایەتی دووره دەست لە شارەکان و دواتریش هەندێکیان هۆکاری بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ئەشعەری بوون (الشاشي الفارقي بەنمونه) هەندێکی تریان لە نێوان ئەشعەریی و پەیڕەوانی نەقڵدا وەستاون و بیروباوەڕیان تێکەڵەیەك بووه لە هی هەردووکیان لە چەشنی هەندێك لە ناودارانی خێزانی سوهرەوەردی کە بەرکەوتەیان لەگەڵ هەولێر و ئەیوبییەکان و کۆمەڵگە کوردییەکاندا زۆر بووه.

بەشی دووەم: تایبەته بە ڕونکردنەوەی بنەما سەرەکییەکانی ئەشعەری وەك ڕێبازێکی عەقیده و تیشکخستنەسەر کەسایەتیی دامەزرێنەرەکەی «أبو حسن الأشعري» و قۆناغەکانی بیرکردنەوەی. لە باسێکی تردا پەرەسەندنی مەزهەبەکە لەسەر دەستی جێگرەوه و ڕێبەرانی تر خراوەتەڕوو کە هۆکاری پاراستن و فراوانکردنی ئایینزاکەبوون لەوانەش: باقلانی و کیای هەراسی و بەیهەقی و فەخری ڕازی و غەزالی، لەگەڵ ئاماژه بە پەیوەندیی هەندێکیان بە ناوچە کوردنشینەکان و ناودارەکانی. هەروەها لەم بەشەدا گرنگترین ئەو بیروباوەڕ و بنەمایانە خراونەتەڕوو کە ئەشعەری جیادەکاتەوه لە مەزهەبە عەقیدەییەکانی دیکەی ئیسلام بە گشتی و حەنبەلییە سەلەفییەکان بە تایبەتی. لە کۆتاییشدا سێ هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەشعەری لە سنوری دەوڵەتی عەباسیدا باسکراوه، کە پەیوەندیی بە پشتیوانی دەسەڵاتی سیاسیی و پێگەی شاری بەغدا و جۆری گوتاری نێوانگری ئەشعەرییەکانەوه هەیە لە نێوان بەرەکانی عەقڵ و نەقڵ.

بەشی سێیەم: تایبەته بە بڵاوبوونەوەی ئایینزای ئەشعەری لەناو کورد لەگەڵ تیشکخستنەسەر هۆکارەکان و شێوازی بڵاوبوونەوەکەی لە ڕێگای شەرعزانەکان و قوتابخانەکان و سیاسەتە ئایینزاییەکانی دەوڵەتەکەی سەلاحەدینی ئەیوبییەوه. پاشان لەسەر مەڵبەندەکانی بڵاوبوونەوەی ئەشعەری هەڵوێسته دەکات لەو ناوچانەی کوردنشین بوون، ئاماژەیش بە ژمارەیەك شەرعزانی شافیعی دەکات کە چالاك بوون لە ئایینزای ئەشعەری، یان گەیشتوون بە دیداری گەوره ڕێبەرانی، چ بە وانەخوێندن بێت، یان خۆیان لە خێزانێکی ئایینی و زانستی ئەشعەریمەزهەب بوون، ژمارەی ئەمانەش لە سەرچاوه مێژووییەکاندا دەوروبەری پەنجا شەرعزان و بانگخواز و کەسایەتی ناسراو بوون و لە پاشکۆی

کۆتاییدا ناو و نازناو و شوێنی ژیان و ساڵی مردنیان پێڕستکراوە.

بەشی چوارەم: تایبەتە بە سۆراغکردنی دابەشبوونی شافیعییە کوردەکان لە نێوان ئەشعەریی و سەلەفییەکان، هەروەها گرنگیدەدات بە حەنبەلییە شوێنکەوتەکانی نەقڵ کە ئێستا پێیاندەوترێت «سەلەفی» و کاریگەرییان لە پانتایی کوردیدا، ژمارەی ئەمانەش بەرچاوە و لە کۆتایی توێژینەوەکەدا پێڕست بۆ ناو و ساڵی مردنیان کراوە، لە پەنا ئەمانەشدا ئەهلی فەرموودە و سۆفییەکانی نێوانگر لە نێوان پەیڕەوکەرانی عەقڵ و نەقڵ هەن. ئەم بەشە لەسەر بەریەککەوتنی ئەشعەریی و حەنبەلییەکانیش لە بەغداد و ناوچە کوردنشینەکان هەڵوێستە دەکات، لەگەڵ ئاماژەکردن بە هەندێك لە فەرموودەناسان «أهل الحديث» لەناو کورددا و دەگاتە ئەو دەرەنجامەش کە شانبەشانی ئەشعەرییەکان لە ناوچە کوردنشینەکاندا شوێنکەوتەکانی نەقڵ و دژبەرەکانی کەلام ئامادەیی و کاریگەرییان هەبووە، نموونەی ئەوانەش ئیبن سەلاحی شارەزووریی و شێخ عەدی کوڕی موسافیر و ئەبو حەسەنی هەکاری و ژمارەیەکی دیکەن لە ناودارانی شارەزووری.

لە پاش بەشەکان، گرنگترین دەرئەنجامەکانە کە توێژینەوەکە پێیگەیشتووە و خستنەڕووی کۆمەڵێك زانیارییە کە هەڵهێنجراوی بنکۆڵکارییە مێژووییەکانی ناو تێزەکەن. سەرەکیترین ئەنجامیش کە توێژینەوەکە پێی گەیشتووە؛ ئەوەیە شوناسی ئاینزایی ناوچە کوردییەکان چ شەرعزانی، یان عەقیدەیی لە نێوان سەدەکانی ٤_١٠ك/١٠_١٤ز فرەچەشنی و فرە جۆری بووە. لە پەنا باڵادەستی ئەشعەریدا، بۆچوونە نەقڵگەراکان و شوێنکەوتنی مانای ئاشکرای دەقەکان جۆرێك لە ئامادەییان هەبووە، لە نێوان ئەم دوو بەرەیەشدا هەندێك لە سۆفییەکان لە نێوان عەقڵ و نەقڵدا لە پێگەیەکی مامناوەنددا وەستاون، جگەلەوەش هەندێك کەسایەتی و ناوداری تری کورد نەچوونەتە نێو مشتومڕەکانی عەقڵ و نەقڵ و نەبوونەتە بەشێك لێی لە چەشنی شەرعزانی ناوداری شافیعی «ئیبنوگەچی دەینەوەری» (مردووە: ٤٠٥ك).

**نووسینی: عەلی حیسامی**

وەرگێڕانی: کامیل کەسنەزانی

# مافی نیشتمان




ئەم بابەتە بە پێشنیاری توێژەری زۆر هێژا «کاک ئیرەج مورادی» نووسراوە.

ئەو دەستە شیعرەی کە لە ڕۆژنامەی کوردستانی ساڵی یەکەم، ژمارە ٢ لاپەڕە ٧، لە لایەن دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە بڵاو کراوەتەوە و دواتر ئەم دەستە شیعرە بە کاک ئەحمەدی موفتیزادەوە لکا، ڕاستی و ناڕاستییەکەی کەوتە ژێر پرسیارەوە، کە لەبەر چاوڕۆشنی و ڕۆشنکردنەوەی بابەتەکە، هەر لەمەڕ ئەم باسە، لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی خوارەوە نووسراوە.

کاک ئەحمەد لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٣٦ی هەتاوی (١٩٥٧ز) بە بڕیاری بنەماڵەکەی، بەرەو تاران ئەڕوا، لەم ماوەی نیشتەجێبوونەدا، لەگەڵ هەندێک لە کەسایەتییەکانی زانکۆ، بەتایبەتی ئەندامانی لیژنەی کۆلیژی یاسا و ئیلاهییات ئەبن بە ناسراو و بەم ئاشنایی و ناسینە، ئەوان لە توانای باڵای زانستیی کاک ئەحمەد بۆ وانەوتنەوە لەو کۆلێژە لە دوو بواردا ئاگادار دەبنەوە؛ یەکەم وانەی کەلام یان فەلسەفەی ئیسلامی و ئەوی تریان، وانەی فیقهی مەزهەبەکان. بەڵام بەهۆی بچووکی تەمەنەوە، مۆڵەتی وانەوتنەوەکەی بەناوی باوکییەوە دەردەچوو.

لە کۆلێژی ئیلاهییات، لە وتنەوەی وانەی زانستی کەلام بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی (١٩٦١ز) مۆڵەتی وانەوتنەوە لە کۆلێژی ئیلاهییات، بە فەرمی بەناوی خۆیەوە دەردەچوو، بەڵام هیچکات مۆڵەتەکە دەستی خۆی نەگەیشت! چونکە کاک ئەحمەد خۆی لە بەندیخانەی (قزل قەلعە) بینییەوە.

لەلایەکی دیکەوە بۆ پەرەپێدان بە کولتووری نەتەوایەتیی کوردی، هەوڵ ئەدات لە ڕادیۆی تاران پرۆگرامێک بە زمانی کوردی ڕێکبخات، تاکوو هەم خزمەتێک بە زمان و کولتووری کوردی بکات و هەم لەناو بەرنامەکەدا، بابەتە ئایینییەکانی خۆی درێژە پێبدات.

لە ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی (١٩٥٨ز) بەڕێز «دادوەر» کە ماوەیەک پارێزگاری شاری سنە بوو و ڕێزی تایبەتی لە کاک ئەحمەد دەگرت، لە وەزارەتی ناوخۆ ئەبێ بە نێوەنج - گوایە لە ڕێگەی بەڕێز ناسر زولفەقاری، جێگری سەرۆک وەزیرانەوە - تا ئاسانکاریی و کارگەلێک بکات. لە ئاکامدا، بەڕێوەچوونی پرۆگرامی کوردی لە ڕادیۆ تاران بە ماوەی «نیو کاتژمێر» بۆ بابەتە ئایینی و ئەدەبیەکان پەسەند کرا. لە جموجووڵ و چالاکییەکانی دیکەیان لە تاران،

هەوڵدان بوو بۆ بڵاوکردنەوەی (ڕۆژنامەی کوردستان) بە زمانی کوردی.

لە دوای ماوەیەک پرۆگرامی ڕادیۆکە بۆ «یەک کاتژمێر و نیو» لە ڕۆژا بەرز دەبێتەوە و لە کەسایەتیگەلێکی دیکە بۆ هاوکاری کردن لە ڕادیۆ بانگهێشت ئەکرێ. ڕێکخراوەی ساواک (ئاسایشی ئەوکاتە) لە پرۆگرامە ڕادیۆییەکانی کاک ئەحمەد زۆر دڵخۆش و ڕازی نەبوون. سەرەڕای ئەوە دوو کەسی دیکە واتە بەڕێزان «سدیق موفتیزادە» و «عەبدوڕەحمان موفتیزادە» کە هەردووکیان مامەی کاک ئەحمەد بوون و لە پرۆگرامی کوردی ڕادیۆ تاران چالاک بوون، حکوومەت لێیان ڕازی نەبوو، هەر لەبەرئەوە دەرچوونی ئیمتیازی ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی ئەوانەوە لەلایەن دەوڵەت جێی ڕەزامەندی نەبوو. لە ئاکامدا بۆ ئەو مەبەستە بەڕێز «عەبدولحەمید بەدیعوززەمانی» کە کەسایەتییەکی خوێنەر و پایەبەرز و دوور لە سیاسەت بوو، هان ئەدرێ ڕەزامەندی نیشان بدات کە ئیمتیازی ڕۆژنامە بەناوی ئەوەوە دەربچێت. ئیمتیازی ڕۆژنامە بە ناوی ئەوانەوە دەردەچێ و کار و چالاکی خۆیان دەستپێدەکەن. لە ڕۆژنامەکە زنجیرە وتارگەلی ئایینی و ئەدەبی، مێژووی کوردستان و ناساندنی کەسایەتییە کوردزمانەکان و باسکردن لە هەندێ لە جوانکارییە ئەدەبییەکان لەسەر شانی «کاک ئەحمەد» بوو.

پاش بەڕێوەچوونی پرۆگرامی کوردی و بڵاوبوونەوەی (ڕۆژنامەی کوردستان)، ڕێکخراوە ئەمنییەکان لە ڕێگەی کەسێک بەناوی «سەرهەنگ پژمان» و چەند کەسێکی دیکە کە لە ڕواڵەتدا لەگەڵ ڕۆژنامە هاوکارییان ئەکرد - بەڵام لە ڕاستیدا نوێنەری ڕێکخراوە ئەمنییەکان بوون- ببوون بەهۆی سەرئێشە و شەڕی دەروونی بۆیان و بەهۆی هەمان «سەرهەنگ پژمانەوە» نووسراوەکانیان سانسۆر و هەندێ جاریش دەستکاری ئەکرا.

کاک ئەحمەد وامان بۆ ئەگێڕێتەوە: «لە هەمبەر کار و ئیشم لە ڕۆژنامەی کوردستان، باس و بابەت زۆرە کە بیگێڕمۆ، کورتەی باس: بەگشتی سێ ساڵ و نیو[1] کە ڕۆژنامەی کوردستان بڵاوکرایەوە، بەردەوام لەژێر گوشاردا بووم.

---

١ جێگەی ئاماژەیە کە: ئەم حەفتەنامە لە مانگی گوڵانی ١٣٣٨ی هەتاوی (١٩٥٩ز) هەتا هەشتی جۆزەردانی ١٣٤٢ی هەتاوی(١٩٦٣ز) بە ماوەی ٤ ساڵ بڵاوکراوەتەوە و کاک ئەحمەد بە هەڵەی زمانی بە سێ ساڵ و نیو ئاماژە ئەکات. ع.ح

زۆرجار کاتێک بابەتەکان ئەچوونە ژێر چاپ، سەر و قەپۆلی «سەرھەنگ پژمان»، بۆ چاودێریکردنی بابەتەکانی ڕۆژنامە پەیدا دەبوو».

بەھیوا بوون بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی کوردستانیش، بەوشێوە بێت کە باوبوو، بەوجۆرەی کە گوشار ئەخرایە سەر چاپەمەنییەکانی ئەو سەردەمە، گوشار بخەنە سەرمان و بەو شێوەی کە دڵخوازی ئەوان بوو، بابەتەکان بنووسم. بەڵام من تا ئەو جێگەی بۆم بلوایەت ھەوڵم ئەدا کە ھاوڕێکانی دیکەش بابەتەکانیان بەشێوەیەک بێ کە زۆر دڵخوازی ئەوان نەبێ، ئەگەرچی بابەتی سەرنووسەری ڕۆژنامەکە زۆر دڵخواز نەبوو و بابەتەکانی دیکەش نادروست ئەنووسرا. ھەندێ جار شیعرگەلێکم ئەنووسی کە زۆر بە حەز و مەیلی ئەوان نەبوو (ئەویش بەبێ ناو، یان بە نووسینی نازناو)، پێیانزانی و ڕێك ئەو کەسەی کە زەوقی شیعریشی نەبوو لە ئەوپەڕی ناجوانکاریی و ناشرینی، دەستی تێوەرئەدا، یان لەژێر چاپ دەریان ئەھێنا و نەیان ئەھێشت چاپ و بڵاو بکرێتەوە، ھەندێجار بەشێوەیەک، بەڵایەکی وایان بەسەر شیعرەکەدا ئەھێنا کە خۆم ناچار ئەبووم لەناو ڕۆژنامەکە بیھێنمە دەرەوە، چونکە ئیتر بەکار نەئەھات. کەسێکی دیکە بوو بەناوی «دوکتور مەنووچیھر موفید»، وادیاربوو کە ئەویش لە لایەن ڕێکخراوی ئەمنی بۆ کۆنترۆڵ و چاودێریکردنی ڕۆژنامەکە ھاتبوو، کە لە بواری ئەدەبیاتدا کەسێکی خوێنەوار و خاوەن زانست بوو، ئەویش، ھەندێکجار دەستکاری شیعر و بابەتەکانی ئەکرد.

یەکێک لەو بابەتانەی کە بۆ نەورۆزی ساڵی دووھەمی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکە ئامادەم کردبوو و ڕێگرییان لێکرد، بابەتێک بوو دەربارەی ئەوە کە : «چلۆن شانشینی ئێران بنەڕەت و ڕۆحی نەورۆزی بەلاڕێدا بردووە؟! و چلۆن (زەحاک)یان بەشێوەی ڕەمز و بنەمای شەڕ و ئاژاوە و کوشتن و بڕین ناساندووە؟ لەکاتێکدا دواھەمین پاشای (ماد) بووە و زۆر سالم، دادپەروەر و بێ ئازار بووە، ئەو شانشینییەی کە لە دوای ئەو پێکھاتبوو، بۆ پاساوی خۆیان، ئەو ھەموو ئەفسانە و چیرۆکە سەیر و سەمەرەیان دەربارەی ئەو سازدا، لەمبارەوە بە تێر و تەسەل قسەم کردبوو و پەلاماری ڕووداوی ئەفسانەی (کاوە)یشم دابوو. ئەم بابەتە چوو بۆ چاپکردن، بەڵام لەژێر چاپ دەریانھێنا. لەبیرمە، بابەتەکە

یەکجار دووورودرێژ بوو، لەبەرئەوەی بابەتێکی دیکەیان نەبوو کە لەجێگەیدا داینێن، بەناچاری دوو لاپەڕە لەو ژمارەی ڕۆژنامەکە بۆ سڕینەوەی ئەو بابەتە، دەرهێنرابوو».

نووسراوەکانی ئەوان لە ڕادیۆ و ڕۆژنامە، خۆی ببوو بە هۆکارێک بۆئەوەی لە کاروباری زانکۆ، هەندێک سەرپێچی ڕوویدات و لە ئەنجامدا ئیزن نەدەن پرۆگرام و بیروهزری ئەو بەشێوەی ڕێکوپێک و جوان و بەو شێوازەی کە پلانی بۆ چنیبوو، بەرەو پێش بڕوات.

وەک دەڵێین لە ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی (١٩٦١ز) لەلایەن «بەڕێز موعەیینیان» سەرۆکی بڵاوکراوەی ڕادیۆوە، بۆ تەواوکردنی چالاکی کاک ئەحمەد لە ڕادیۆ، بڕیارێک دەردەچێ و دوای شەش مانگیش «ڕۆژنامەی کوردستان» دادەخرێت و هەموو ئەو کتێبە کوردییانەی کە سەندرابوون و زۆربەی ئەو پەرتووکە کوردییانەی کە نووسرابوون- و لە نووسینگەی ڕۆژنامە لە چاپخانەی ئەختەری باکوور، لە پەنای باڵەخانەی پەروەردە و فێرکاری ئەو کاتەوە دائەنرا- دەستی بەسەر گیرا و هیچ کاتێک نەدرایەوە.

لە ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی (١٩٦٣ز)، چەند مانگ لەدوای بەستنی پرۆگرامی ڕادیۆ کوردی و دوای ئەویش ڕۆژنامەی کوردستان، لەگەڵ زۆرێک لە کوردانی نیشتەجێی تاران، بە تۆمەتی ئەندامبوون لە حیزبی دیموکراتی کوردستان و چالاکی نیشتمانی بەدەستی کەسێک بەناوی «سەرهەنگ زیبایی» لە ماڵەوە دەگیرێت و لە بەندیخانەی «قزلقەلعە» دەستبەسەر دەکرێت.

ئەم گوشار و لەمپەرانە بۆ چالاکییە هزریی و کۆمەڵایەتییەکانی کاک ئەحمەد باڵی بەسەر گۆڤار و بڵاوکراوەکانیشدا کێشابوو. لە ساڵی ١٣٤٣ ی هەتاوی (١٩٦٤ز) لە بەندیخانەی «قزلقەلعە» گۆڤارێک بەناوی (خواندنیها) ئەگەیشتە دەست بەندکراوەکان، لە یەکێک لە ژمارەکانی، بابەتێک دەربارەی شتە تازە دۆزراوەکانی گەردوون لە چاپ درابوو. بە ئیلهام لەم نووسراوە، کاک ئەحمەد بابەتێک دەربارەی «موتەشابیهاتی قورئان»، بۆ ئەو گۆڤارە دەنێرێت. ئەگەرچی لەوکاتەدا بابەتەکە ناڕواتە دەرەوەی بەندیخانەکە و لەلایەن بەرپرسەکانی بەندیخانەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت، بەڵام لەدوای

مۆڵەتی کاتی هاتنەدەرەوە لە زیندان، بابەتەکە دەنێرێت بۆ گۆڤارەکە و چاپ دەبێ. سەرنووسەر بە بینین و چاولێکردن لە بابەتەکە، زۆری پێخۆش دەبێ و ڕایدەگەیەنێت کە کاک ئەحمەد دەتوانێت نووسراوەکانی خۆی بەشێوەی مەقالە بۆ گۆڤارەکە ڕەوانە بکات و زۆرترین مافی نووسینیش وەربگرێت. کاک ئەحمەدیش دووەمین مەقالەی خۆی سەبارەت بە ڕووداوێکی بنەماڵەیی-کۆمەڵایەتی کە لە بڵاوکراوەکاندا ببوو بە دەنگۆی، دەنووسێت، بەڵام لە چاپ نادرێ! «بەڕێز تلووعی» سەرنووسەری گۆڤار بە ڕاشکاوی ئاشکرای دەکات کە: هەر بابەتێک دەینێرین بۆ چاپکردن، کەسانێک لە ساواک چاودێری دەکەن، کەوابوو بابەتەکان بەشێوەیەک بنووسن کە بتوانین لەناو گۆڤارەکەدا بڵاوی بکەینەوە. لە وەڵامی «بەڕێز تلووعی»دا، کاک ئەحمەد ئەم حیکایەتە دەگێڕێتەوە: «ڕۆژێک مامۆستایەک لە پەنای هەندێ خەڵکی عەشایەر کە زۆربەی کات و ژیانی خۆیان خەریکی کۆچ و بارکردن بوون و کەسایەتی زانا و خوێندەوار و مەلایان کەمە، تێدەپەڕێ. مامۆستا لە کاتی بانگ، دەچێتە سەر تەپۆڵکەیەک و بانگ دەدا، خەڵکیش کە هەتا ئەوکاتە هەر دەنگی بانگیان نەبیستبوو، بە سرتە سرت و قریوە قریوە یەکتریان چاو لێدەکرد و بە سەرسووڕمانەوە هۆکاری کارەکەی مامۆستا دەپرسن. کەیخوا، دەچێتە لای مامۆستاکە و لێی دەپرسێ، ئەم دەنگە دەنگە چی بوو؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە کە ئەمە بانگە و هێمای ئەوەیە کە کاتی نوێژە و خەڵکی دەبێ بۆ خوێندنی نوێژ هەستن. کەیخوا لە قسەکانی مامۆستا حاڵی نابێت و لەکۆتاییدا کەیخوا ڕوودەکاتە مامۆستا و دەپرسێ: ئەم بانگە بۆ بزن و مەڕەکەی ئێمە زیانی هەیە یا نا؟ مامۆستایش وەڵام دەداتەوە کە: ئەم بانگە بۆ مرۆڤە و هیچ زیانێکی بۆ بزن و مەڕەکەی ئێوە نییە! کەیخواکەیش دەڵێ: ئێستا کە وایە، هەر چەندە کە دەتوانی، دەنگ و هەرا بکە و بقیڕێنە!».

لە دوای گێڕانەوەی حیکایەتەکە، ڕوودەکاتە «بەڕێز تلووعی» و دەڵێ: «بەڕێز تلووعی، من ناتوانم بابەتێک بنووسم کە بە زیانی گورگ نەبێ، کەوابوو ئەگەر دەستم ببڕن، تەنانەت ئەگەر بابەتی زانستی بنووسم، بەدڵنیاییەوە بەشگەلێکی، زیان بە گورگ دەگەیەنێت، چونکە ئەوەی بۆ کۆمەڵگای ئێمە پێویستە،

ئاگادارکردنەوە و ڕۆشنکردنەوەی میللەتەکەیە. «بەڕێز تلووعیش» لە وەڵامدا دەڵێ: «ئەگەر بابەتەکانی ئێوە بەمشێوە بێ، ئێمە ناتوانین لە چاپیان بدەین.»

هەر لەم چەشنە مەقالاتەی بۆ ڕۆژنامەی (اطلاعات) و (کیهان) دەبا، هەردوولا داوای لێبوردن دەکەن کە ناتوانن ئەمە چاپ بکەن. «بەڕێز میسباح زادە»، بەڕێوبەری یەکێک لەو ڕۆژنامانە، بە ڕاشکاوی پێی دەڵێت: «مۆڵەتی لە چاپدانی بابەتەکانی ئێوەمان پێ نادەن» و ئەمە خۆی هۆکارێک دەبێ بۆئەوەی کاک ئەحمەد مەیلی نووسینی نەمێنێت.

کاک ئەحمەد لە گێڕانەوەی کارەکانی خۆی لە ڕۆژنامەی کوردستان، لە دوو قۆناغی زەمانیدا ئاماژە بە سانسۆر، سڕینەوە و دەستکاریکرانی شیعرەکانی خۆی دەکات.

دەکرێت بڵێین، کە ئەمە ڕوویداوە. شیعری «مافی نیشتمان» ئەتوانرێ ئەو ڕاستییە دەربخات. مانا و مەفهووم و ڕۆحی ئەم شیعرگەلە لە ئاسەواری وتووێژ و هەڵوێستی سیاسی و شەڕ و بەرگریکردن بەتەواوەتی دەبینرێت. لەلایەکی دیکەوە، کاک ئەحمەد لە نەوارەکانیدا، وردبینی و گرنگ بوونی تایبەت، لە بەکارهێنانی هێما جوانکارییەکانی هەیە کە لەم بەیتانەدا بە جوانی دەبیندرێت و ئەم چەشنە لە دانانی هێما جوانکارییەکان بەم سەرنجەوە لە شیعری کەسانی دیکە، کەمتر دەبیندرێ، کە لەم بەیتانەدا هێمای سەرسووڕمان (!) بە زۆری بەکار هێنراوە، کە هێمای ئەوەیە کاک ئەحمەد خاوەنی شێوازێکی تایبەتە. زەوقی شیعری ئەوان لە هەمان ڕۆژنامەدا، بەتایبەت لە وەرگێڕانی شیعرەکانی (داستان هزار و یک شب)دا کە لەلایەن ئەوەوە وەرگێڕدراوە، بە ئاشکرا دیارە[1].

کەوایە ئەگەر ئەم شیعرە هی کاک ئەحمەدە، بۆچی لە ڕۆژنامەکەدا بەناوی «دەستەی نووسەران»ەوە بڵاوکراوەتەوە؟ ئەگەر سەرنجی ژمارە سەرەتاییەکانی ڕۆژنامەکە بدەین، بۆمان دەرئەکەوێت کە لە ژمارەی ١٠ بەولاوە وردە وردە نووسەری بابەتەکان، ناوەکانیان دەنووسرێت، بۆ نموونە: بابەتەکانی (لە

---

١ چیرۆکی (هزار و یک شب) لە لایەن مامی کاک ئەحمەد، واتە مەرحوومی عەبدولڕەحمانی موفتیزادە وەرگێڕانی بۆ کردووە، کە بۆ وەرگێڕانی شیعرەکانی لە کاک ئەحمەد یارمەتی وەرگرتووە

کۆمەڵا چۆن بژین؟)، (چۆن بنووسین و بخوێنینەوە؟)، (دیوانی مەلا پەرێشان)، (بەشی مەولەوی)، (لە هەر گوڵزارێ گوڵێ)، لە ژمارەی ١٠ بەولاوە بە (ص) واتە: محمد صدیق موفتیزادە هاتووە، یان بابەتی (نەتەوەی کورد و نەتەوایەتی ئێران) لە ژمارەی دوانزە بە (ش. بابان) واتە: شوکروڵڵا بابان هاتووە، یان بابەتگەلی (مێژووی ڕەگەزی کورد) نووسراوی زانای مەزنی کورد ئێحسان نووری کە بەناوی «دەستەی نووسەر» وەرگێڕدراوە.

لەڕاستیدا ئەو بابەتە لە لایەن جەنابی ئاغای عەبدولڕەحمانی موفتیزادەوە نووسراوە کە لە ژمارەی ١٠ بەولاوە بە (ع موفیزادە) هاتووە و (مەتەڵە)، لە ژمارەی ١٠ بەولاوە نووسەرەکەی واتە عەبدولڕەحمانی موفتیزادە، ئاشکرا کراوە، هەروەها بابەتی (بۆ پێکەنین)، (ئامۆژگاری) و تەنانەت بابەتی (چیرۆکی هەزار و یەک شەو) کە لە هەر ژمارەیەکدا بەشێک لەو چیرۆکە هاتووە، لە ژمارەی تەرتیبی ٥٢، واتە ژمارەی یەکەمی ساڵی دووهەم، چواردەی گوڵانی ساڵی ١٣٣٩ی هەتاوی (١٩٦٠ز) بۆ یەکەمجار ناوی نووسەرەکەی بەکار هاتووە و هەر لە هەمان ژمارەدا، ئاماژە بەوە دەکات کە شیعرەکانی چیرۆکی هەزار و یەک شەو، هی کاک ئەحمەدی موفتیزادەیە. هەروەها بابەتی (وتاری دینی)، (وێژەی کوردستان)، (باسێکی زانیاری)، (جەدوەل)، یا (چوار قوژبنەکان)، لەلایەن کاک ئەحمەدی موفتیزادەوە نووسراوە کە لە ژمارەی ١٠ بەولاوە، بە ئامادەکراوی (ا - موفتیزادە) ئاماژەی بۆ کراوە. هەروەها نموونەگەلی تر زۆرن کە نووسەرەکەی بە «دەستەی نووسەران» لە قەڵەم دراوە و دواتر نووسەرەکەی ناسێندراوە. هەروەها لە ژمارەی یەکەمی ساڵی دووهەم، واتە ژمارەی ٥٢ تەرتیبی ڕۆژنامە لە لاپەڕەی یەکەم، بۆ یەکەمین جار، نووسەرانی هەر بابەت و بەشێک بە ناو و وێنەوە دەناسران، بۆ نموونە بابەتی (نالەبارییەکانی کۆمەڵ)، (هەڕاڵە و زەمزەمە)، لە (ع سیراجەددین) کە لە هەندێک لە ژمارەکاندا ناوی لێ نەبراوە و نموونەگەلێکی زۆر ئەتوانین لە ڕۆژنامەکەدا بدۆزینەوە. ئەمانە ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە نووسەری هەندێک لە بابەتەکان بە (دەسەی نووسەر) یان بە شێوەی پیت ناسێنراوە یان هەر ئاماژە بە نووسەر نەکراوە. ڕەنگە سیاسەتی

بەڕێوبەرایەتی ڕۆژنامە وابووبێت کە دواتر کەم کەم، نووسەران بناسێنرێن. کەواتە ئەتوانین بڵێین: بەپێی ئەم بەڵگانە، ئەوەی کە لەژێر ئەم شیعرەدا (دەسەی نووسەر) هاتووە، ناتوانرێت بوترێ کە شاعیرەکەی کاک ئەحمەدی موفتیزادە نییە.

بەڵام لە بارەی دوو بەیتی ١٩ و ٢٠ کە دەستێوەردانی تێدا کراوە و لە ڕۆژنامەکەدا ئاوا هاتووە:

**کوردە! دین و نیشتمان و شایە بەرزی ژینی تۆ**
**دژمنی هەرسێکیانە، دژمنی بێ دینی تۆ**
**هەر بژی شا و نیشتمان و هەر بژی ئایینی تۆ**
**با لە داخان شەق ببا بەدخواهی تۆ بەد بینی تۆ**

لە کاک هادی مورادی، یەکێک لە قوتابیان و هاوڕێ نزیکەکانی کاک ئەحمەد بەتایبەتی لە ساڵەکانی ١٣٤٦ تا ١٣٥٧ی هەتاوی واتە (١٩٦٧ز تا ١٩٧٨ز)، بە وتەی خۆیان زیاتر لە خزم و کەسە نزیکەکانی، پەیوەندی لەگەڵ کاک ئەحمەددا بووە، لە وەڵامدا ئاوا هاتووە:

« لە ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی (١٩٦٩ز) بۆماوەی چەندین ساڵ لە تاران لەگەڵ کاک ئەحمەد، لە شوقەیەک بەیەکەوە ئەژیاین. ئەو ماوە دەرفەتێکی زۆر باش بوو بۆ گفتوگۆ و باس و خواسی جیاواز لە بابەتەکانی هزری، ئایینی، کۆمەڵایەتی و...، کە بەداخەوە ئەو بابەت و گفتوگۆیانە نە تۆمارکراوە و نە نووسراونەتەوە.

بابەتێکی دیکە کە کاک ئەحمەد زۆر بە شیکاریی و بە وردی لەبارەیەوە قسەی بۆ کردووم، بابەتی بڵاوبوونەوەی «ڕۆژنامەی کوردستان» و ئەو جۆرە بابەتانە بووە. بەتایبەت دەربارەی گوشارەکانی ڕێکخراوەی ساواک لەسەریان، لە یەکێک لە گێڕانەوەکانیان دەربارەی شیعری «مافی نیشتمان»، دەستێوەردان و گۆڕینی دوو بەیتی ١٩ و ٢٠ لە کۆی ئەم شیعرانە بوو. کاک ئەحمەد دەڵێ: ئەم دوو بەیتە لە ڕۆژنامەکە هاتووە ساختەیە و دەڵێ کە لەلایەن هێزی دزەکەری سازمانی بەرگری (ساواک) دەستکاریی و گۆڕانی تیاکراوە. کۆی ئەم شیعرەی بۆ خوێندمەوە. پێموایە نوسخەی دەستخەتەکەیشم لەو کاتەدا بینیوە،





بەڵام بەداخەوە خۆم دووبارە نەمنووسینەوە و ئەسقەزا (بە ڕێکەوت) هیچ ئاسەوارێک لە دەستنووسەکەی کاک ئەحمەدیش نەماوە.

بەڵام کاتێک ئەگەڕێمەوە بۆ بیر و مێشکی خۆم، ئەو دوو بەیتە ئەبێ شتێکی ئاوا بێ یان نزیک لەوە:

**کوردە! دین و نیشتمانی تۆیە بەرزی ژینی تۆ**

**دژمنی هەردووکیانە، دژمنی بێ دینی تۆ**

**نیشتمانت هەر بمێنێ و هەر بژی ئایینی تۆ**

**با لە داخان شەق ببا بەدخاهی تۆ، بەدبینی تۆ**

**جیا لەو ڕەخنە ئەدەبیی و وەزنیەی کە لەسەر ئەم دوو بەیتە هەیە.**

بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە هەموو هەڵوێستە فیکری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئایینییەکانی کاک ئەحمەد، ناتوانین زمانی مەدح و پێداهەڵگوتن بدۆزینەوە و ئەدەبیاتی وتار و نووسراوی کاک ئەحمەد بە توندی لە مەدح و پێداهەڵگوتن، ئەویش بۆ دەسگای شاهەنشاهی زۆر نامۆ و بێگانە و دوورە. لەلایەکی دیکەشەوە، لە نزیکەکان و قوتابیان و هاوڕێکانی بە تەواتوور گەیشتووە کە ئەم شیعرە هی جەنابیانە و دووبارە لەم ساڵانەدا نە بە ئەرێنی و نە بە نەرێنی کەسێک کە بڵێ ئەم کۆمەڵە شیعرە هی کاک ئەحمەد نییە، نەبینراوە، هەر لەبەرئەوە ئەتوانین بڵێین کە: شیعری «مافی نیشتمان» هی مەرحووم کاک ئەحمەدی موفتیزادەیە و ئەو شتەی کە کەوتووەتە دەست خەڵکی یان ئەوەی کە لە کۆمەڵە شیعری «دیاری بۆ یاران»دا چاپ و بڵاوکەرەوەی «مەکتەب قورئانی کوردستان» هاتووە، کێشەگەلێکی هەیە.

هەر بەوهۆیەوە، دووبارەنووسین و دروستنووسینی لە ڕووی نوسخە ئەسڵییەکەی ڕۆژنامەکە و هەروەها گێڕانەوەکەی «کاک هادی» دەربارەی ئەو دوو بەیتە پێشکەش ئەکرێ:

## مافی نیشتمان

نیشتمان! ئـــەی خاک و خۆڵی تۆ کڵەی چاوانمە
نیشتمان! ناوی بەڕێزت هـــــــێزی ڕۆح و گیانمە
نیشتمان! ئەی بەربەیانت ڕۆشنی ئیمانمە
نیشتمان! ئێــوارەکانت خـــــەڵوەتی عــــــرفانمە
نیشتمان! قوربانی کوێستانت، دڵی پڕ دەردی من
نیشتمان! حەیرانی گەرمێنت، هەناسەی سەردی من
نیشتمان! سەرمەشقی بەرزی هیممەتە کۆماری تۆ
مەرکەزی زانســـــــتی و عرفانە لادێ و شاری تۆ
نیشتمان! باغـــــاتی فیردەوسە، هەموو گوڵزاری تۆ
عزەت و فەخرە هەموو نەخشی دەر و دیواری تۆ
نیشتمان! ئەی شاخ و داخانت ئۆمێدی دڵ هەموو
نیشتـــــــمان! دەشت و بیابانت بەهەشتی ئارەزوو
نیشتمان! شـەرتە کە تۆزی ڕێت بە ئەم دنیا نەدەم
شەرتە تــــــــا ماوم لە شەرتی گیانفیدایی لا نەدەم
نیشتمان! شەرتە لە عەشقی پاکی تۆ سەر با نەدەم
شەرتە قەت گوێ بۆ ڕەقیب و وەسوەسەی ئەعدا نەدەم
نیشتمان! ئەی فێنکیی قەلبم شنەی کوێستانەکەت
نیشتمان! ئەی ئاوی ژینم خــــــاکی کوردستانەکەت
نیشتمان! ئێحسانی تۆیە خوێنی باوباپیری من
هێزی شان و نووری دیدە و قۆدرەتی تەدبیری من
نیشتمان گەر خوێنی من پاکە و حەڵاڵە شیری من
هەر لەسەر ڕێی خۆشەویستیی تۆیە بڕوا و بیری من
نیشتمان! دایم لە سەر ئاواتی بەرزی ناوی تۆم
خاترت جەم بێ، بەڵا گەردانی خاک و ئاوی تۆم

لاوی کورد! ئەر پاکە شیرت هەستە وەک شێری ژیان
ڕاکە مەیدان بۆ بەجێهێنانی مافی نیشتمان
ڕۆڵەکەی سوڵتان «صلاح الدین»! نەخۆی گۆڵی کەسان
ڕۆکنی ئیمان خۆشەویستیی نیشتمانە بێ گومان
لاوی کوردم! خۆت نەکەیتە داری دەستی دژمنت
دژمنت نەتباتە مەیدان بۆ برای خۆ کوشتنت
کوردە قەت نەنوی بە لایەی دژمنی عەییارەوە
شـــــــیری دوژمن تێکەڵە حەتمەن بە ژاری مارەوە
ڕەنگ نەکەی داوێنی نامووست بە لەکەی عارەوە
نیشـــــــتمانت دایـــکتە، نەیدەی بەدەس ئەغیارەوە
ڕەنجی باو باپیری تۆ ئەم نیشتمانەی دا بە تۆ
کوردە! وریـــــــا بی، نەکەی باپیرەکانت ڕەنجەڕۆ
کوردە! دین و نیشـــــــــتمانی تۆیە بەرزی ژینی تۆ
دژمنی هەردووکیانە، دژمنی بێ دینی تۆ
نیشتمانت هەر بمێنێ و هەر بژی ئایینی تۆ
با لە داخان شەق ببا بەد خاهی تۆ بەد بینی تۆ
هەستە سا، هەر وەک «ترێشقە» ڕیشە کەن کە دژمنت
تـــــــــا بـــە فێڵ و گەڕ لە ڕیشەی دەرنەهێناوە بنت

## سەرچاوە:

کتێبی (ما و انقلاب) و نەواری ١٢٥ کاک ئەحمەد موفتیزادە و گێڕانەوەی نزیکان و قوتابیانی کاک ئەحمەد.

قسه و ڕەفتاری سەکردە و کەسی سیاسیی دەبێت بە وریایی و ئاگایی و هوشیارییەکی قوڵەوە بێت، چونکە بۆ چینێکی دیاریکراو قسە ناکات، بەڵکوو بۆ میللەتێك قسە دەکات کە لەڕووی تەمەن و ڕەگەز و ئایین و چینی کۆمەڵایەتی جیاواز ... تاد پێکدێت، هەر دەستەواژەیەك یان ڕەفتارێکی ناپەروەردەیی و ناشارستانی لە نزیك مەودا و دوور مەودادا کاریگەریی نەرێنی دروست دەکات و دەبێتە هۆی لاساییکردنەوەیان لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵگەوە.

ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٢٠٢٤/١٠/١٨ دەنگدانی تایبەتی و ٢٠٢٤/١٠/٢٠ ڕۆژی یەکشەممە دەنگدانی گشتی بۆ هەڵبژاردنی خولی شەشەمی پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدرا. گوتاری بەشێکی گرنگی لایەن و سەرکردە سیاسییەکان تەنانەت ئەندامەکانیان گوتارێکی زۆر توند و زبر بوو، بەجۆرێك مرۆڤ زۆرجار ناچار دەبوو نەتوانێت هەتا کۆتایی وشەکانیان ببیستێت!

لەکاتی هەڵبژاردن و لە کاتە ئاساییەکانی تریشدا سیاسییەکان دەبێت بە هەموو جۆرێك ئاگایان لە ڕەفتار و هەروەها ئەو وشە و دەستەواژانە بێت کە لە زمانیان دێتەدەر، چونکە کاریگەریی خۆیان لەسەر هاوڵاتییەکانی بەجێدەهێڵێت بەتایبەتتر لەسەر فێرخواز لە ناوەندەکانی خوێندن.

لە دوای هەڵبژاردنەکان کە دەوامی قوتابخانە و خوێندنگەکان دەستیپێکردەوە لەڕووی کردەییەوە مامۆستایان هەستیان بە کاریگەریی قسە و ڕەفتاری سیاسییەکانیان زیاتر بۆ دەرکەوت، چونکە فێرخوازەکان لە پۆلدا ئەو ڕەفتار و وشە خراپ و دەستەواژە ناپەروەردەیی و توندوتیژانەیان دووبارە دەکردەوە کە سیاسییەکان لەکاتی هەڵبژاردندا دەیانکرد و دەیانگووت. سیاسییەکان لەبری ئەوەی ڕۆڵیان هەبێت لە چارەسەرکردنی گرفتە پەروەردەییەکان، بەپێچەوانەوە کێشەیەکی تریان بۆ مامۆستا و پەروەردەکاران زیادکرد ئەویش ڕاستکردنەوەی هەڵەی سیاسییەکانە لەکاتی قسەکردن و ڕەفتارکردنیاندا! بەناوی (تای هەڵبژاردن)ەوە بەشێکی زۆری هێزەکان هەموو وشەیەکی نەشیاو و ڕەفتارێکی سەیروسەمەرە دەکەن بەبێ ئەوە ئاگایی ئەوەیان هەبێت دەرهاویشتەی چۆن دەبێت و بیر لەوە بکەنەوە کە فێرخوازی قوتابخانە و خوێندنگەکان سەیریان دەکەن و دواتر دەبێتە مۆدا!

گوتار و ڕەفتاری بەشێکی گرنگی سیاسییەکان گوتار و ڕەفتارێکی توندوتیژە، بۆ خۆنمایشکردن و خۆسەلماندن پشت بەهێزی سەربازی دەبەستێت! ئەمە جگەلەوەی لە گوتارەکانیاندا بە ڕوونی هەست بە توندوتیژی زمانی دەکرێت و ئەم توندوتیژی زمانییە دەبێتە میوانی هەمیشەیی فێرخوازان و لاساییان دەکەنەوە. توندوتیژی زمانی هەر ئەوەندە بوو بە کولتوور ئیدی سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ئاسان نابێت، بە بەڵگەی ئەوەی لە چەند دەیەی پێشتر سیاسییەکان هەموو توندوتیژییەکی زمانییان تاقیکردەوە ئێستاش کۆمەڵگەی کوردی باجەکەی دەدات و هەرماوە!

توندوتیژی زمانی ڕەفتارێکی زمانی درکاو یان نووسراوە کە مۆرکێکی پەلاماردەرانە یان بەرگریکارانە وەردەگرێت، تاك یان کۆمەڵێك لە دژی تاك یان کۆمەڵ یان دەستەیەکی تری بەرانبەر پیادەی دەکەن، جا ئامادەبێت یان نائامادە، ئەمەش لەکاتی ڕوودانی زیانێکی ماددی یان مەعنەوی یان لەکاتی ڕوودانی ڕووبەڕووبوونەوە یان پێشبڕکێ یان ململانێ یان دەستدرێژی، توندوتیژی زمانی دەتوانرێت لە ڕێگەی تێبینیکردنی ڕاستەوخۆوە لەکاتی پیادەکردنی هەستی پێ بکرێت. ئەم جۆرە لە سنووری زماندایە پشت بە بەکارهێنانی ڕەق و زبری زمان دەبەستێت(١).

لەبارەی کاریگەریی لاساییکرنەوەی ڕەفتاری سیاسیی و سەرکردەکانەوە دەگەڕێینەوە بۆ ڕووداوێکی مێژوویی سەرنجڕاکێش، چیرۆکێك لەبارەی (لویسی چواردەیەم) پاشای فەڕەنسا دەگێڕنەوە، کاتێك لویس لە شەوە ئاهەنگێکدا لە کۆشکەکەیەوە بەرەو لای میوانەکانی دەڕوات  و بەهۆی بارینی بارانەوە دەرلنگی پانتۆڵەکەی هەڵدەکات، کە دەگاتە ئاهەنگەکە لە بیری دەچێت قەراغی پانتۆڵەکەی دابداتەوە، هەربۆیە بۆ سبەی شەو تەواوی ئاهەنگێڕان بە مۆدێلەکەی لویس پانتۆڵەکەیان کورت دەکەنەوە، لێرەوە مۆدێلی فەڕەنسیی پانتۆڵ داکەوت کە تەنانەت دوای دوو سەدەش لەکاتی داگیرکردنی فەڕەنسا لەلایەن نازییەکانەوە، هیتلەر بەو هەموو زەبر و زەنگەوە نەیتوانی ئەو مۆدێلە بسڕێتەوە(٢). لە ڕێگەی ئەم نموونە مێژووییەوە تێ دەگەین سیاسییەکان کە دەبێت چەند بە ئاگاییەوە دەستەواژەکان دەرببڕن و ڕەفتار بنوێنن.

وانەیەك هەیە بەناوی (مافی مرۆڤ)، پۆلی دەیەم بە هەر دوو قۆناغی وێژەیی و زانستی دەیخوێنن، ئەم وانەیە بۆ هەر مامۆستایەك دەیڵێتەوە دەبێتە ئیحراجی بۆی! چونكە هەندێك بابەتی تێدایە لەگەڵ گوتار و ڕەفتار و دونیابینی بەشێكی گرنگی سیاسییەكاندا نایەتەوە، بۆ نموونە لەوانە (پاراستن لە توندوتیژی) و (جیاوازی نەكردن لە بەردەم یاسادا)، لە كتێبەكەدا باس لەوە دەكات دەبێت مرۆڤ ئازار و ئەشكەنجە نەدرێت، هەروەها توندوتیژیی و ئەشكەنجە بەپێشێلكردنی مافی مرۆڤ دادەنرێت، لە باسی جیاوازی نەكردن لە بەردەم یاسادا لە ناوەڕۆكدا باس لەوە دەكات دەبێت یاسا بەسەر هەمووواندا وەك یەك جێبەجێ بكرێت و كەس لەسەرووی یاساوە نەبێت بەهەر بیانوویەك بێت، یان بەهۆی پلەوپایەی سیاسی دەسەڵات، باری ئابووریی و كۆمەڵایەتی ... تاد(٣). دەپرسین سیاسییەكان ئەوە دەكەن كە پرۆگرامەكە و مامۆستای وانەكە دەیڵێت؟ چونكە ئەگەر وانەبێت پەیامە پەروەردەییەكە ناگات، مامۆستایان هەمیشە ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبنەوە لەلایەن فێرخوازەكانیانەوە و دەپرسن: مامۆستا تۆ و پرۆگرامەكەش باسی گرنگی یاسا و سەروەری یاسا و خراپی توندوتیژی ... تاد دەكەن، بەڵام لە دەرەوەی خوێندنگە لێپرسراو و سیاسیی و سەركردەكان پیادەی ناكەن ئیدی ئێمە بۆچی بیخوێنین؟!

لە قوتابخانە و خوێندنگەكان دەبێت بە لێبوردەیی و دوور لە زمانی زبر و توندوتیژیی و بەشێوەیەكی شارستانی و بە دیموكراسی مامۆستا لەگەڵ فێرخوازەكانی قسە و ڕەفتار بكات، بەڵام ئەمە هەتا ئەو كاتە ئامانجی خۆی دەپێكێت كە سیاسیی و سەركردەكان بەهەمان شێوە ڕەفتار لەگەڵ هاونیشتیمانی خۆیاندا بكەن ئەگەرنا جێی خۆی ناگرێت.

گوتار و ڕەفتارەكانی سیاسیی و سەركردەكان نابێت پێچەوانەی گوتار و ڕەفتارەكانی ناو قوتابخانە و خوێندنگە بێت، ئەوەی تێبینی دەكرێت ئەوەیە دیموكراسی لای ئێمە هەنگاوێك ناچێتە پێشەوە و لەگەڵ دونیای پێشكەوتوودا ناڕۆین، هۆكەشی ئەوەیە ئێمە ئەمانەوێت لە قوتابخانە و خوێندنگەكان فێرخوازەكان بە میتۆدی نوێ و پەروەردەی هاوچەرخ ئاشنا بكەین، كەچی بەشێكی گرنگی سیاسی و سەركردەكان پێچەوانە قسە و ڕەفتار دەكەن، ئەمەش

وا دەكات كاریگەری نەرێنی دروستبكات و پەروەردە و فێربوون لە قوتابخانە و خوێندنگەكان ئامانجی دروستی خۆی نەپێكێت. (ژان ژاك ڕۆسۆ) لە كتێبی (ئێمیل) دەڵێت:( تكا دەكەم لە مامۆستا گەنجەكان ئەوەیان لەبەرچاو بێ كە لەسەر هەر بابەتێك دەبێ قسە و كردەوەتان یەك بێ، چونكە منداڵ زۆر خێرا ئەو شتەی دەیڵێن و دەبیستن لە بیریان دەچێتەوە، بەڵام ئەو كارانەی دەیكەن و ئەوەی لەگەڵیان دەكرێت درەنگتر فەرامۆشی دەكەن)(٤)، ئەمەی ڕۆسۆ دەیڵێت وەك چۆن بۆ مامۆستا ڕاستە بۆ سیاسی و سەركردەكانیش هەر ڕاستە. ئەگەر مامۆستا بۆ هەمیشە باسی عەدالەت و یەكسانی و ڕێزگرتن لە جیاوازی ... تاد بكات بۆ فێرخوازەكانی پەیامەكەی ناگات تاوەكوو سیاسی و سەركردەكان گوتار و ڕەفتاریان هەمان گوتار و ڕەفتاری مامۆستاكە نەبێت!

قوتابخانە پەیامی بەرزوباڵای هەڵگرتووە، هەربۆیە پێویستە لە هەر شێوازێكی خراپ بەكارهێنانی زمان، یان هەر شێوازێكی تری نەشیاوی ناپەروەردەیی و ناشارستانی بەدووربێت، قوتابخانە دەبێت بەردەوام هونەری ڕێز لەیەكگرتن و ئەنجامدانی گفتوگۆی بنیادنەرانەی لەسەرخۆ و ئامانجداری پەیوەندییەكان بێت. لەكاتی هەر ڕا جیاوازییەكیەكیش بۆ ڕازیكردنی بەرانبەر پشت بە بەڵگە و وەڵام و هەڵوێستی زانستی و لۆجیكی ئەزمونكراو و سەلمێنراو ببەستێت. قوتابخانە دەبێت ئەركی ڕاهێنان و مەشقپێكردتی قوتابی لە ئەستۆی خۆی بگرێت هەتا بتوانن ڕەخنەی زانستی و بابەتی بنیادنەرانە بگرن، تا نەوەكانی ئاییندە فێری بەها باڵاكانی لێبوردەیی و قبوڵكردنی بەرانبەر ببن، بكرێنەوە بەڕووی هەر جیاوازییەك دوور لە هەڵچوون و ڕەگەزپەرستی و توندڕەویی و لادانی هزری، ئایینی، ڕامیاری، كۆمەڵایەتی(٥). ئەمانە هەمووی كاتێك لە نەوەكانی ئاییندە دێنەدی كە لەگەڵ گوتار و ڕەفتاری سیاسییەكان بێنەوە و هاودژ نەبەن.

جوگرافیناسی ناسراو مامۆستا (كەریم زەند) لە پۆلی شەشی سەرەتاییدا مامۆستای (پ.د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ) بووە، ڕۆژێك مامۆستا كەریم زەند دەچێتە پۆلەوە و داوا لە قوتابییەكان دەكات كاغەز دەربێنن بۆ ئەوەی فیدباكی قوتابییەكان بزانێت بەرانبەر خۆی، پێیان دەڵێت بنووسن و

پرسیارێکتان لێ دەکەم ئەویش ئەوەیە ڕات چییە بەرانبەر من؟ یەکێك لە قوتابییەکان هونەرمەند (شەماڵ سائیب) دەبێت و وەڵامێك دەداتەوە بۆ مامۆستا کەریم زەند دەبێتە جێگەی سەرسوڕمان و دەیەوێت بزانێت کێ نووسیویەتی، مامۆستا کەریم زەند دەپرسێت و شەماڵ سائیب دەڵێت: من نووسیومە، ئەویش دەڵێت: باشە ئەوە نووسیوتە تۆ مامۆستای چاکی، دەرسی باش دەڵێیتەوە، بەڵام کە دەچیتەماڵەوە خواردن حازر نابێ، لەگەڵ دایکت شەڕ دەکەیت، پیاوێك پیاو بێ، چۆن لەگەڵ دایکیدا شەڕ دەکات؟ مامۆستا کەریم زەند وتوویەتی: باشە، تۆ حساباتی ماڵی من چۆن دەزانی؟ لە کوێوە زانیوتە و دەیزانی؟(٦). فێرخواز بەوشێوەیەیە تەنیا گوتار و ڕەفتارەکانی ناوخۆی قوتابخانە و خوێندنگە کاری تێناکات، بەڵکو دەرەوەشی بۆ گرنگە و کاریگەریی لەسەر دروست دەکات.

فێرخواز ئەگەر بزانێت ئەوانەی ناو خوێندنگە کە فێری دەبێت خزمەت بە دەرەوەی خوێندنگە ناکات ئەوەی دەرەوەی خوێندنگە وەردەگرێت نەك ئەوەی ناوەوەی خوێندنگە، چونکە دەرەوەی خوێندنگە هێز و دەسەڵاتی زیاترە لە ناوەوەی خوێندنگە، ئەگەرچی ئەوەی ناو خوێندنگە باشتریش بێت! دەکەوێتە بەراوردکاری ئەگەر بۆی دەربکەوێت ئەوەی پرۆگرامەکان و مامۆستاکان باسی دەکەن و دەیڵێن بۆ نموونە لەبارەی پاراستنی ژینگە و ئازادی ڕادەربڕین و سەروەری یاسا و بە ئاشتی چارەسەرکردنی کێشەکان و گرنگی دیموکراسی ... تاد لەگەڵ گوتار و ڕەفتاری سیاسی و سەرکردەکان یەکناگرێتەوە و ئاسمان و ڕێسمان جیاوازن، ئەوە ئەوکات فێرخواز پەروەردە و فێربوونەکەی کاریگەریی لەسەر نابێت. ئەمە نەك هەر بۆ فێرخواز ، بەڵکو بۆ مامۆستاش دروستە، بە بەڵگەی ئەوەی وەزارەتی پەروەردە زۆرجار دەیەوێت بەناو جیا جیاوە پەرە بە توانای مامۆستا بدات و خولیان بۆ بکاتەوە و ڕاهێنانیان پێ بکات و ئاستی پەروەردەیی و زانستی قوتابخانەکان بەرز بکاتەوە، کەچی دەسەڵاتداران و لێپراسراون و سیاسییەکان بەجۆرێك گوتار دەدەن و ڕەفتار دەکەن تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی وەزارەتی پەروەردە دەیەوێت، هەربۆیە مامۆستاش پابەند نابێت و وەك شتێکی ڕۆتینی دەیبینێت!

کایەی پەروەردە و فێربوون لە قوتابخانە و خوێندنگەکان کایەیەکی هەستیار و گرنگە، کاتێك ئەڵمانیا شکستی هێنا بەرانبەر ناپلیۆن لە سەدەی نۆزدەدا خەڵکی ئەڵمان تووشی جۆرێك لە ڕووخان و بێزاری و بێتاقەتی بوون، لەو کاتەدا فەیلەسووفی ئەڵمانی (فیختە) گوتارێکی ئاڕاستەی گەلی ئەڵمان کرد و باسی لەوە کرد ئەم شکستە شکستێکی پەروەردەییە پێش ئەوەی شکستێکی سەربازی بێت، داوای ئەوەی کرد پێویستە سیستەمی فێرکرنی ئەڵمانی بگۆڕدرێت بە سیستەمێکی نوێی پەروەردەیی(٧). سیاسییەکانی باشووری کوردستان بەهۆی ئەوەی پارەیان بۆ دەرناهێنێت و مەترسی بۆ کورسییەکانیان دروست دەکات دواشت بیری لێ بکەنەوە گرنگیدانە بە کایەی پەروەردە و فێرکردنێکی هاوچەرخ و پێشکەوتوو، وەزارەتی پەروەردەش هەتا ئەو سنوورە دەیەوێت پەروەردە پێشبخات کە لە سنووری وەزارەتەکەی دەرنەچێت، یان ڕاستتر ئەوەش ناکات، چونکە ئەگەر وابوایە بۆ نموونە سادەترینیان ئەوەیە دەبوایە بۆ بوون بە بەڕێوەبەری خوێندنگەیەك حزبیبوون مەرجی یەکەم نەبوایە!

مێژوونووسی ناسراوی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠-١٩٤٨) هەرزوو ئەوەی بۆ دەرکەوت گوتار و ڕەفتاری سیاسییەکان چەند خراپ و نەرێنییە، هەربۆیە ساڵی ١٩٢٧ دەبێتە وەزیری مەعاریف(پەروەردە)ی عێراق لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی دەوامی ئەو ساڵەدا لە مانگی ئەیلوول و بە دیاریکراوی لە ٢٩/٩/ ١٩٢٧ گوتارێك ئاڕاستەی هەموو فەرمانبەرەکانی وەزارەت و دام و دەزگاکانی سەر بەوەزارەت دەکات، گوتارەکە چەند باسێك لەخۆدەگرێت، دیارترینیان باس لە قەدەغەبوون و ڕێگە پێنەدانی فەرمانبەران دەکات بە کارکردن لەگەڵ سیاسەت و حزبە سیاسییەکان(٨). نە لە عێراق و نە لە هەرێمی کوردستان ئەوەی محەمەد ئەمین زەکی بەگ داوای کردووە جێبەجێ نەکراوە، ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە ئێستا هەرێمی کوردستان و عێراقی تێدایە!

هەموو ئەو وڵاتانەی پێشکەوتوون سیاسیی و سەرکردەکانیان گوتار و ڕەفتارەکانیان ڕەنگدانەوەی سیستەمە پەروەردەییەکە بووە و باوەڕیان پێی

بووە، نەك سیستەمی پەروەردەیی شتێك بڵێت و بكات ئەوانیش شتێكی تر بڵێن و بكەن! هەندێكجار وەزارەتی پەروەردە دەیەوێت سیستەمی خوێندنی بكاتە سیستەمێكی مۆدێرن و پێشكەوتوو (زۆرجاریش بۆ نمایشە)، بەڵام بەپێچەوانەوە سیاسی و سەركردەكانی سیاسی و سەركردەیەكی كلاسیكی بن و نەگۆڕێن و لە قاوغی خۆیاندا بمێننەوە! كۆریای باشوور بۆیە بوو بەو كۆریای باشوورەی ئێستا دوابەدوای ئەوەی لە شەڕی یەكەم و دووەمی جیهانی دەوڵەتی كۆریا بە بارودۆخێكی پڕ لە هەژاریی و نەهامەتی و داگیركاری تێپەڕبوو ڕژێمی ئەو وڵاتە هەوڵیدا بە ڕێگەی سیستەمی پەروەردە گۆڕانكاریی لە وڵات بێنێتە كایەوە و ئەو كۆمەڵگەیە بەرەو ئاڕاستەیەكی دیموكراسی ببات(٩). و برديشی، چونكە ڕەنگدانەوەی هەبوو لە گوتار و ڕەفتاری سیاسییەكانیاندا.

گوتار و ڕەفتاری سیاسییەكان تاوەكوو بەوشێوەیەی ئێستا بەردەوامی هەبێت زانست و پەروەردە و فێربوون لە ناوەندەكانی خوێندن بەرەو پێشەوە ناچێت. دەمێكە خەمخۆرانی ئێمە داوایان لێكردووین ئەو پەڵەی بەناو چاوانمانەوەیە بیسڕین، پەڵەی دواكەوتوویی! ئەوەتا لە ژمارە (٥ و ٦)ی گۆڤاری (گەلاوێژ)ی ساڵی ١٩٤٢ وتارێك نووسراوە بە ناونیشانی (قوتابی و قوتابخانە)، نووسەری وتارەكە بەراوردی نێوان دونیای پێشكەتوو دەكات لەگەڵ كۆمەڵگەی كوردی كە ئەوان چۆن لە ڕووی زانست و زانیاریی و پەروەردە و فێركردنەوە پێشكەوتوون و كوردیش دواكەوتووە، نووسەری وتارەكە لە شوێنێكدا دەنووسێت: (ئێمە كە گەلێكی دواكەوتووین هیچ نەبێت پێویستمانە چاو لەو گەلانە بكەین و لە لاسایی كردنەوەیان فەرامۆش نەبین. تا زانست لە هەموو قورنەیەكی خاكەكەمانا بڵاوبكەینەوە و ئەم پەڵەی وا بەناو چاوانمانەوە بیسڕین و ئەو قوڕەی وا بە شانمانەوە لایبەین و بیتەكێنین)(١٠).

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- د. هەڵمەت سەردار عەمەر: خراپ بەکارهێنانی زمان لە بواری پەروەردەدا، چاپی یەکەم، زنجیرە چاپکراوەکانی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٢٤، ل٤٨٢-٤٨٣.

٢- دکتۆر یاسین سەردەشتی: وتارگەلێکی ڕەخنەیی مێژوویی، چاپی ئینتەرنێت، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٩، ل٤٩.

٣- ئا/ یوسف عوسمان حمد: مافی مرۆڤ، حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان، چاپی یەکەم، ٢٠٢٣، ل٢٨، ٢٩.

٤- ژان ژاك ڕۆسۆ: ئێمیل، وەرگێڕانی/ ڕەسوڵ سوڵتانی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر، هەولێر، ل١١٤.

٥- د. هەڵمەت سەردار عەمەر: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦٤.

٦- ئازاد عەبدولواحید: پ.د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ ئەزموونێکی بە بڕشت و قەڵەمێکی سەربزێو، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٩، ل٢٤-٢٥.

٧- الدکتور احمد جودة: تاريخ التربية والتعليم فی العراق وأثره فی الجانب السياسی ١٥٣٤م-٢٠١١م، الجزء الأول والثانی، الطلعة الأولى، شرکة نورس بغداد للطباعة، بغداد، ٢٠١٢، ص١٩.

٨- الأستاذ الدکتور قحطان حميد کاظم و الأستاذ الدکتورة سلمى مجيد حميد و الأستاذ الدکتور عبدالرزاق عبدالله زيدان: الوجيز فی التاريخ التعليم فی العراق ١٩١٤- ١٩٦٨، المطبعة المرکزية، جامعة ديالى، ٢٠٢٢، ص٣٤٣-٣٤٤.

٩- چنار سەعد عەبدوڵڵا: پەروەردە و نەتەوایەتی «لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆجیی مێژووییە لە هەرێمی کوردستان»، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ وبڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٦٧.

١٠- ع. چالاك: قوتابی و قوتابخانە، گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژمارە(٥ و ٦)، ساڵی سێیەم، مایس و حوزەیران ١٩٤٢، ل٣٤.



**کارمەند هۆشیار محەمەد**

نووسەری ڕۆژنامەگەری تەلارسازی

# تێڕوانینێك لە مێژووی تەلارسازی ئیسلامی

## ڕەگەز و تایبەتمەندیی و شێوازەکانی - جواننووسی عەرەبی



جواننووسی عەرەبی بە یەکێك لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی تەلارسازی ئیسلامی دادەنرێت. تایبەتمەندییەکانی شارستانیەتی ئیسلامی زۆرن لەوانە: جواننووسی عەرەبی کە زۆر لە دیکۆراتی ناوەوەی بیناکانی ئیسلامی بەکارهاتووە وەك مزگەوتەکان. هەرلە سەرەتایی هاتنی ئایینی ئیسلامەوە ئاگاداری جواننووسی عەرەبی بووە، پێغەمبەر (د.خ) هاوەڵێکی بەناوی (موعاز بن جەبەلی) ڕاسپارد کە خۆی فێری نووسین و جواننووسی بکات، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش پێی فەرموو: (دەبێت جواننووسی باش پراکتیزە بکەیت، چونکە کلیلی بژێوی ژیانە). هەروەك ئیبن عەباس فەرموویەتی (جوانووسی ڕاستییەکان ڕوونتر دەکاتەوە).

* جواننووسی لە زۆر شوێنی ناو باڵەخانەکانی ئیسلامی بەکارهاتووە لەوانە
أ-دەروازەی چوونە ژوورەوەی کۆشکەکان، گومەز و منارەکان، باقی ڕەگەزەکانی تری تەلارسازی ئیسلامی.
ب- تابلۆی هونەری.

*جۆرەکانی فۆنتی عەرەبی:
أ-ڕێنووسی کوفی: کۆنترین ڕێنووسە و جوانترین نەخشی هەیە بۆ ڕازاندنەوەی بیناکان و نووسینە گەورەکان بەکارهاتووە.
ب-ڕێنووسی ثلث: سەرسوڕهێنەرترین و جوانترین و قورسترین ڕێنووسە.
ت-ڕێنووسی ڕێگەپێدان و واژۆکردن: ئەم ڕێنووسە لە ڕێنووسی (نسخ و ثلث) وەرگیراوە، ئەم ڕێنووسە لەو بڕوانامانە دەنووسرێت کە لە (ڕاهێنانی ڕێنووسدا) بەشداری دەکەن.
پ - ڕێنووسی نسخ: یەکێکە لە لقەکانی ڕێنووسی ثلث، ئەم ڕێنووسە قورئانی پیرۆزی پێ نووسراوە، بووە بە ڕێنووسی چاپکردنی پیتەکان.
ج- ڕێنووسی فارسی: پێی دەوترێت (نەستعلیق) و کورتکراوەی (تەلیقە)، سەرچاوەکەی لە ڕێنووسی پەهلەوی وەرگیراوە بە ڕێنووسی پانایی جیادەکرێتەوە.
ح- ڕێنووسی دیوانی: ڕێنووسێکی ڕەنگین و ئاسانە و بۆ نووسینی نامەی شاهانە بەکاردێت.
خ- ڕێنووسی ڕووقعە: ڕێنووسێکی خێرا و ئاسانە و لە لایەن توورکەکانەوە داهێنراوە.

د-ڕێنووسی توغرا: ڕێنووسی وێنەکێشانی ناوی سوڵتانەکانە لە شێوەی واژۆیەکی هونەریدا، لەلایەن مەملوکەکانەوە بەکارهاتووە، بەڵام پێشەنگەکانی بەکارهێنانی ئەم ڕێنووسە سوڵتانە عوسمانییەکان بوون.

ژ-ڕێنووسی مەغرەیبی: لە ڕێنووسی کۆنی کوفییەکانەوە وەرگیراوە پێی دەگوترا (ڕێنووسی قیروان) پاشان پێی دەوترا (ڕێنووسی ئەندەلوسی یان قورتووبەیی).

و- ڕێنووسی ئەلتاج: لە ساڵی 1925 لە وڵاتی میسر داهێنراوە و زیادکردنی تاجێکە بۆ پیتی یەکەمی هەر وشەیەك لە ڕێنووسی نسخدا.




شێوەی ژمارە (١) نموونەی جوانووسی عەرەبی




شێوەی ژمارە (١١) نموونەی نووسینی کوفییەکی بچووک




شێوەی ژمارە (٢) نموونەی جواننووسی عەرەبی




شێوەی ژمارە (٤) ڕێنووسی کوفیەکی دێکۆراتی




شێوەی ژمارە (٣) ڕێنووسی کۆنی کوفی



شێوەی ژمارە (٥) نمونەی جواننووسی عەرەبی




شێوەی ژمارە (١٥) پەنجەرەی دیکۆرات بە ڕێنووسی کوفی - ڕووکاری پشتەوەی مزگەوتی ئەلمەغفیرە



شێوەی ژمارە (٦) نموونەی جواننووسی عەرەبی



خط كوفي مزهر



خط كوفي بسيط







شێوەی ژمارە (٧) نمونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز











شێوەی ژمارە (١٠) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز




شێوەی ژمارە (٨) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز




شێوەی ژمارە (٩) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز



شێوەی ژمارە (١٢) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز



شێوەی ژمارە (١٣) نموونەی هەندێك فۆنتی عەرەبی




شێوەی ژمارە (١٦) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز



شێوەی ژمارە (١٧) نموونەی فۆنتەکانی عەرەبی جیاواز



شێوەی ژمارە (١٨) نووسراوەکان بەشێوەی ئایەتی قورئان لەسەر ناوەوەی قوبەی مزگەوتێك



شێوەی ژمارە (١٩) نووسراوەکان بەشێوەی ئایەتی قورئان لەسەر ناوەوەی  ژووری کەناڵی (ئێن ئاڕ تی٤) کە هی جواننووسی بەناوبانگ (نەهرۆ قادر)ە.



شێوەی ژمارە (٢٠) نووسراوەکان بەشێوەی ئایەتی قورئان لەسەر ناوەوەی مزگەوتێك کە هی جواننووسی بەناوبانگ (نەهرۆ قادر)ە.

## المصادر


١-موسوعة عناصر العمارة الإسلامية، المهندس الاستشارى، يحيى وزيرى.

٢- المساجد فى مدن العربية، المعهد العربى لاونماو المدن، الرياض، ١٩٩٠.

٣- التراث المعمارى الإسلامى فى مصر، د. صالح لمعى مصطفى، دار النهضه العربية بيروت، ١٩٨٣.

٤- أسس التصميم المعمارى والتخطيط الحضرى فى العصور الإسلامية المختلفة، د.عبدالباقى ابراهيم، منقمة العواصم و المدن الإسلامية، القاهرة، ١٩٩٠.

٥-العمارة فى صدر الإسلام، وزاره الثقافة، القاهرة.

٦- موسوعة العمارهة الإسلامية، د.عبدالرحيم غالب، بيروت، ١٩٨٨.

٧- لمحات من تاريخ العمارة و الحركات المعمارية و روادها، شيرين احسان شيرزاد، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.

٨- العماره العربيه بمصر، محمود أحمد، الهيئة المصرية العامة للكتاب.

٩- القباب فى العمارة الإسلامية، د. صالح لمعى، دار النهضة العربية، بيروت.